

ئۆف ... خوایە!

ئەوین و زانیاری و کار سەرچاوەکانی ژیانمانن.

دەبێت کاریگەرییەکی گرنگیشیان لەسەری هەبێت و ئاراستەی بکەن.

ولیام ڕایش



ویلیام ڕایش، لە ساڵی ١٨٩٧ لە گالیسییێن لە دایک بووە. دەرمانسازی، لە ڤییەنا، خوێندووە و لە سەرەتای بیستەکانی چەرخی بیستەمیندا بووە بە ئەندام لە "کۆڕی شیکردنەوەی دەروونی"دا، کە سیگمۆند فرۆید پێشڕەوی دەکرد. تا ساڵی ١٩٣٤ لە نزیکەوە هاریکاریی فرۆیدی کردووە. ساڵی ١٩٣٠ ڤییەنای جێهێشتووە و چووەتە بەرلین. لەوێ خۆی بە کاری تەندروستبوونی دەروونی و وانەوتنەوە لە "کۆمەڵەی شیکردنەوەی دەروونی" و "کۆمەڵەی کرێکارە مارکسییەکان" تەرخان کردووە. هەروەها بزووتنەوەی SEXPOOLی دامەزراندووە، کە دواتر بۆتە بزووتنەوەیەکی بەربڵاو لە سەرانسەری ئەڵمانیادا.

دوای گرتنەدەستی دەستەڵات لە لایەن نازییەکانەوە، مینا پەناهێنێک، بەرەو دەوڵەتە سکەندناڤیاییەکان، ئەڵمانیا بە جێ دەهێڵێت و پاشان لە ساڵی ١٩٣٩دا ڕوو دەکاتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. لە ئەمەریکا، بە کاری توێژینەوە لەسەر "وزەی ژیان" کە بە "وزەی ئۆرگۆن" ناودێری کردووە، خەریک دەبێت. خەریکبوونی بەو توێژینەوەیەوە دەبێت بە هۆی نارەزاییی دامودەستگا دەستەڵاتدارەکانی ئەوسا و بە زیندانکردنی کۆتایی دێت. پاشان هەر لە زیندان، لە ساڵی ١٩٥٧دا، دەمرێت.

ئێوە؛ پیاوە کۆنەپەرستە دووڕووە ساختەکان کە پێم پێ دەکەنن.
لەو کاتەوە کە بەڕێوەبردنی ئەم دنیایەتان کەوتووەتە دەست،
ڕامیاریتان لەسەر چی دەژی؟
لەسەر کوشتار و کوشتن و بڕین!

شارلس دۆ کۆستەر، بۆ ئولێنشپێگل

# پێشەکی

ئەم نووسراوەیە؛ نووسراوەیەکی سەر بە زانستە مرۆڤییەکانە، نەک نووسراوەیەکی زانستی. هاوینی ساڵی ١٩٤٩ بە نیازی پاراستن بۆ ئەرشیڤی پەیمانگای ئۆرگۆنی نووسراوەتەوە و ئاکامی ئەو دژایەتییە دەروونییەیە، زانا و پزیشکێک، لە ماوەی دە ساڵاندا، لەگەڵیدا ژیاوە. سەرەتا بە خۆشباوەڕییەوە، دواتر بە سەرسووڕمان و پاشان بە ترسەوە، بەرانبەر بەو کار و هەڵسوکەوتانەی "بۆرەپیاو" لە دژی خۆی دەیانکات، کە چۆن ئازار دەکێشێت، یاخی دەبێت و چۆن بە دوژمنەکانیدا هەڵدەڵێت و چۆن هاوڕێیەکانی خۆی دەکوژێت و لە نێویان دەبات، کە چۆن هەر کاتێک مینا "نوێنەری کۆمەڵانی خەڵک" دەستەڵاتی دەکەوێتە دەست، خراپ بە کاری دەهێنێت و دەیکات بە شتێکی زۆر لەو خونخوارییە بەدتر کە، بەر لە بەدەستهێنانی، دەستدرێژکارانی چینی بەدەستەڵات، دژ بە خۆی بە کاریان دەهێنا.

ئەم نووسراوەیە؛ "وتەیەک بۆ پیاوە بچووکەکە" پارێزگاریکردنێکی بێدەنگ بوو دژ بە خراپەباسکردن و لە پاشملە قسەبۆهەڵبەستن. کاتێک کە نووسرا، کەس لەو بڕوایەدا نەبوو دامەزراوەیەک کە بەرپرسیی تەندروستیی خەڵکی لە ئەستۆ گرتبێت، لەتەک پیاوانی ڕامیاری و ئەو دەروونناسانەدا کە تەنیا لەدوی بەدەستهێنانی پلەوپایە دەگەڕێن، هەڵبکوتنە سەر توێژینەوە لەسەر وزەی ژیان. ئێمە، ساڵی ١٩٤٧، بڕیارمان دا ئەم نووسراوەیە، مینا نووسراوەیەکی مێژوویی، بڵاو بکەینەوە. لە کاتێکدا کە دەردی هەستونەستەکان هەڕەشەی لە کوشتن و لەناوبردنی توێژینەوەی زانستی دەکرد لەسەر وزەی ژیان، *هەڕەشەیەک نەک بە بەڵگەوە بیسەلمێنێت کە ئەو توێژینەوەیە ناجۆر و ناڕاستە، بەڵکو لە ڕێگەی بەخراپەلێدوان و لە پاشملە گوناهبارکردنەوە.* دوای کەمێک بیرکردنەوە، بە پێویستمان زانی کە دەبێت "پیاوەباوەکەی خەڵک" لەوە ئاگادار بکرێتەوە، کە لە ڕاستیدا زانایاک، دەروونناسێک،

چییە و ئەو "پیاوە گرگن"ـە، لە چاوی ئەو زانا و دەروونناسەوە چۆن دەبینرێت. ئەو "پیاوە باو"ە، دەبێت خۆی فێر بکات، کە تەنیا لەڕێی تێگەیشتنەوە لە هەقیقەت، دەتوانێت دژی هەوڵدانی بۆ بەدەستهێنانی دەستەڵات، بوەستێت. مرۆڤ، پێویستە ڕوون و ئاشکرا پێی ڕابگەیەنێت، کە "ئەو" چ بەرپرسییەکی لە ئەستۆدایە بەرانبەر بەو کارانەی دەیانکات، بێ گوێدان بەوەی، کار دەکات، خۆشەویستی دەکات، ڕکەبەری دەکات یا دەپەیڤێت. دەبێت فێر ببێت بۆ دەبێت بە فاشییەکی سوور یا ڕەش. هەریەک لە ئێمە، کە لە پێناو پاراستنی ژیان و منداڵەکانیدا دەجەنگێت، پێویستە لەسەری لە دژی چ فاشییە سوورەکان، چ ڕەشەکان، کار بکات؛ لەبەر ئەوە نا کە سوورەکان، مینا ڕەشەکانی ئەوسا، خاوەنی بیروڕایەکی قڕکەرن، بەڵکو لەبەر ئەوەی "ئەوان" منداڵانی تەندروست و زیندوو دەکەن بە کەسانی پەککەوتە و لەیستۆک و گەلۆر، دەیانکەن بە کەسانی دەبەنگ بۆ پاراستنی ڕەوشت و ئاکاری باو، لەبەر ئەوەی دەوڵەت لە سەروو یەکسانییەوە، درۆ لە سەروو ڕاستییەوە و جەنگ لە سەروو ژیانەوە دادەنێن، لەبەر ئەوەی منداڵان و بەرگریکردن لە هێزی ژیانیان، تەنیا هیوایەکە تا ئێستا لە دەستمان نەدابێت.

پزیشکان و مامۆستایان، تەنیا یەک ئەرکیان لەسەر شانە، ئەویش: متمانە و باوەڕکردنیانە بەو هێزی ژیانەی لە منداڵان و نەخۆشاندا هەیە. ئەگەر بێت و لەگەڵ ئەو متمانە و باوەڕەی خۆیاندا سەرڕاست بن، ئەوا ئەو پرسە گەورانەیش کە بە "پیادەکردنی ڕامیاریی دەرەوە"وە بەندن، ئاسانتر چارەسەریان بۆ دەدۆزرێتەوە.

ئەم نووسراوەیە ناکرێت وەک ڕێپێشاندەرێک لە ژیاندا سەیر بکرێت. تەنیا لە بارەی ئەو تەوژمانەی هەستونەستەوە دەدوێت کە لە ناخی کەسێکی بە بەرهەمدا هەیە، کەسێک کە ژیانی خۆش دەوێت. بەو نیازە نەنووسراوە قایل بکات، یا ڕێهەڵگرانی بۆ پەیدا بن. چۆن تابلۆیەک تەوژمێک پێشان دەدات، ئەم نووسراوەیش لە بارەی ئەزموونەکانەوە دەدوێت. لە خوێنەر داوا ناکرێت هەستی

لایەنگرانەی خۆی دەرببڕێت. دەکرێت یا بیخوێنێتەوە، یا سووک و ئاسان بیخاتە لاوە و لە بیری بکات. هیچ بەرنامەیەکی لە خۆ نەگرتووە. ئەو زانا و نووسەرەی نووسیویێتی تەنیا یەک شت لە خوێنەرەکەی داوا دەکات، ئەویش: ڕاچەنینێکی تاکەکەسییە، ڕاچەنینێک کە قەت دەرهەق بە شاعیران و فەیلەسووفان نکوڵی لێ نەکراوە.

ئەم نووسراوەیە بەرزکردنەوەی دەنگی نارەزایی زانایەکە کە شێلگیرانە دژ بە پلانی نهێنی و لێنەدواوی دەردی هەستونەستەکان بووە، ئەو پلانەی کە ئامانجی لەبەینبردن و لەناوبردنی ئەوی هەبووە بەو تیرە ژەهراوییانەی لە حەشارگەیەکی نادیارەوە تێی گرتوون. ئەم نووسراوەیە پێشان دەدات "دەردی هەستونەستەکان" چییە و چۆن کار دەکات و بە چ جۆرێک رێ لە بەرەوپێشچوون و پەرەسەندن دەگرێت. بێ لەمەیش گرنگیدانێکی تایبەت و هەڵسەنگاندنێکی بەبایەخی ئەو بڕوایەیە کە پشتی بەو گەنجینە لەبننەهاتووە بێشومارە بەستووە کە لە قووڵاییی "سروشتی مرۆڤانەی مرۆڤ"دا هەیە و بە کار نەهێنراوە، ئەو گەنجینەیەی کە ئامادەیە بۆ بەکارهێنان و پڕکردنەوەی خولیا و هیواکانی مرۆڤ.

ژیان لە ناخی مرۆڤدا، لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە ئینسانییەکاندا، دڵپاک و دۆستانەیە، هەربۆیەیش لە هەلومەرجێکدا کە لە ئێستادا بەرکەماڵە، دەخرێتە مەترسییەوە. ژیان لە خۆیەوە دەنوارێت و دەرئەنجام لە کەسانی دیکەدا بە دەست دەهێنێت. بێگومانە لەوەی کە هاومرۆڤانی دیکەیش، مینا خۆی، دڵاوایانە بیر دەکەنەوە و هەڵسوکەوت دەکەن و بەپێی هەلومەرجێک کە سروشتی زیندوو هێناویەتە کایەوە، دەستی یارمەتی درێژ دەکەن و دۆستایەتی دەکەن. ئەم هەلومەرجە سروشتییە بناغەیە هەم بۆ منداڵانی تەندروست و هەم بۆ مرۆڤی دێرینی سەرەتایی و نوێنەرایەتییان دەکات. تا ئەو کاتەی "دەردی هەستونەستەکان" بەرکەماڵ بێت، بێ دوودڵی، مەترسییەکی گەورە لەسەر بەدەستهێنان و گەیشتن بە شێوەژیانێکی زیرەکانە بەرکەماڵە،

چونکە ئـەو دەردە شێوە هەڵسوکەت و بیرکردنەوەیەک بە هاومرۆڤانی تر ڕەوا دەبینێت کە بە خۆی ڕەوا بینیوە. مرۆڤی پاک لەو بڕوایەدایە کە هەموو مرۆڤانی دیکەیش پاکن و بە پاکییەوە هەڵسوکەت دەکات. مرۆڤی بەد و دڵپیسیش لەو بڕوایەدایە هەموو مرۆڤانی دیکەیش، ڕێک وەک خۆی، درۆ دەکەن و هەڵدەخەڵەتێنن و بەدەستهێنانی دەستەڵات شێت و هاری کردوون. ئاشکرایە کە لەسەر ئەم بنچینانە ژیانی زیندوو دنە نادرێت و لە مەترسیدایە. لە هەر جێیەک ئەو بەد و دڵپیسە هەبێت، ژیان هەڵدەلووشرێت و دەبێت بە مایەی گاڵتەپێکردن و خیانەت بەرانبەر کردن، لە هەر جێیەکیش جێی باوەڕ بێت، هەڵدەخەڵتێنرێت.

ئەمە هەمیشە ڕاست بـووە. ئێستایش ئیتر کاتی ئـەوە هاتووە ژیان خۆی کۆ بکاتەوە و سەخت بێت، چونکە سەختی و ڕەقی لـە خەباتی بەدەستهێنانی سەربەستی و بەرەوپێشچوون و پەرەسەندندا پێویستە، بەڵام لەگەڵ ئەو سەختییەیشیدا، ئەگەر لە پێناوی پاراستنی هەقیقەتدا بێت، چاکیی خۆی لە دەست نادات. هیوا و خۆزگەکان بێ بنەما نین، لەبەر ئەوەی لەنێو میلۆنان مرۆڤی سەرڕاست و کارکەردا، چەند کەسانێک هەن کە پەتای نەخۆشیی هەستونەستەکان پەکی خستوون، کەسانێک کە بەدکارییەکی بێسنوور دەکـەن، لەو ڕێیەوە کە پەنا دەبەنە بەر بەکارهێنانی هێزە پڕ مەترسییە تارک و نووتەکەکانی نێو دەروونی مرۆڤانی باو و "ڕەقوتەق و وشکهەڵاتوو"، پڕچەک و ئامادەیان دەکەن بۆ بەدەستهێنانی کوشتوبڕی ڕامیاری. هیچ ڕێگاچارەیەکی دیکە لە بەردەمی مرۆڤی باو و ئاساییدا نییە بۆ ئەوەی خۆی لە تووشبوونی ئەو پەتایە بپارێزێت کە تووشی هەستەکانی دەبێت، پاراستنی هەستونەستەکانی خۆی نەبێت بەرانبەر بە ژیانی ڕاستەقینە. ژیان هیچ داوایەکی نییە بۆ بەدەستهێنانی دەستەڵات، تەنیا داوای ئەوە دەکات کە ڕۆڵی گرنگ و دانپێدانراوی خۆی لە ژیانی مرۆڤانەدا لەڕێی ئەوین و کار و توانستەوە ببینێت.

هـەر کەسێک بخوازێت ژیانی زیندوو لە دەست تووشبوونی

دەردی هەستونەستەکان بپارێزێت، دەبێت خۆی فێر بکات سوود لەو سەربەستیی دەربڕینە ببینێت کە ئێمە لە ئەمەریکا بە نیازێکی پاک، هەر نەبێت هێندەی تووشبووان بەو دەردە بە نیای خراپ بە کاری دەهێنن، سوودی لێ وەربگرێت. ئەگەر ئاوەز هەلی بۆ هەڵ بکەوێت بە هەمان تواناوە خۆی دەرببڕێت لە ئاکامدا سەرکەوتن بە دەست دەهێنێت. سەرکەوتنێک کە گەورەترین ئاواتمانە.



تۆ پیاوێکی "بچووک" و "ئاسایی"یت.

تۆ بە "گرگن" و "پیاوی باو" ناو دەبـەن. هەواڵی دەستپێکی چەرخێکی نوێت پێ ڕادەگەیەنن: "چەرخی بۆرەپیاوان، چەرخی گرگنەکان." تۆ نیت ئەمە ڕادەگەیەنیت پیاوی بچووک! بەڵکو ئەوانن: جێگری سەرۆککۆماری نەتەوە گەورەکان، ڕێبەرانی کرێکاران "ئەوانەی خوێندنی باڵایان بە دەست هێناوە"، نەوەی پیاوە دارا پەشیمانەکانی نێو شارەکان، پیاوانی دەوڵەت و فەیلەسووفەکانن، ئەم هەواڵە ڕادەگەیەنن. ئەوانن داهاتووت پێ دەبەخشن، بەبێ ئەوەی لە ڕابـوردووت بپرسنەوە. تۆ میراتگری ڕابوردوویەکی تۆقینەریت و میراتەکەت، مینا گەوهەرێک، لەنێو دەستەکانتدا دەگرێت. ئەمەیان من پێت ڕادەگەیەنم.

هەر پزیشکێک، پینەدۆزێک، پیشەوەرێک یا مامۆستایەک، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو کارەی لە ئەستۆیدایە بە جێی بهێنێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بژێویی خۆی دابین بکات، دەبێت پێویستییەکانی خۆی بزانێت. دەمێکە سەروەرییت پچڕیوە و دەستەڵاتی سەر ئەم زەمینەت بە دەست هێناوە. داهاتووی مرۆڤایەتی بە چۆنێتیی بیر و بۆچوون و هەڵسوکەوتی تۆوە بەندە، بەڵام مامۆستا و سەروەرەکانت پێت ناڵێن "تۆ" لە ڕاستیدا چیت، یا چۆن بیر دەکەیتەوە. کەس ناوێرێت ڕووبـەڕووی ئەو ڕاستییەت بکاتەوە کە تین و توانێکی وەهات دەداتە بەر بتوانیت بێباکانە ببیت بە سەروەری چارەنووسی خۆت. تۆ، تەنیا بە یەک مانا "سەربەست"یت، ئەویش سەربەستبوونتە لە ڕەخنەلەخۆگرتن، ڕەخنەیەک کە یارمەتیت دەدات، تا بتوانیت جڵەوی ژیانی خۆت بگریتە دەست.

هەرگیز گوێم لە سکاڵا و گازندەت نەبووە بڵێیت: *"ئێوە هێندە منتان هەڵدا تا بوومە سەروەری داهاتووی خۆم و ئەو دنیایەی تێیدا دەژیم، بەڵام پێتان ڕانەگەیاندم کە مرۆڤ دەبێت چۆن بکات تا ببێت بە سەروەری خۆی. لە هەڵەکانم ئاگادارتان نەکردمەوە، ئەو هەڵانەی سەراپای بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتەکانی گرتوومەتەوە."*

تۆ، ڕێ بە دەستەڵاتداران دەدەیت وا پێشان بدەن کە دەستەڵاتیان

داوەتـە دەسـت "بـۆرەپـیـاو"ەکـە، بـەڵام خـۆت بێدەنگ، هەمیشە بێدەنگ، دەمێنیتەوە. تا دێت زیاتر دەستەڵات دەدەیتە دەست پیاوانی سەردەست، یا کەسانێکی لاواز و پووتی وا هەڵدەبژێریت نوێنەرایەتیت بکەن کە هیچ نیازێکی پاکیان نییە لە بەدی و چەپەڵی زیاتر. هەمیشە درەنگ و ناوەختیش لە خۆت بە ئاگا دێیتەوە کە دووبارە و جارێکی تریش، فریو دراویت.

تێت دەگـەم، چونکە هـەزاران جار بە ڕووت و قووتی دیومیت، ڕووت و قووت هەم بە لەش و هەم بە ڕۆح. بێ دەمامک، بێ پشتگیری، بێ پسوولەی دەنگدان، بێکەس و تەنیا دیومیت. دیومیت وەک زیندەوەرێکی تازەلەدایکبوو، وەک سوپاسالارێکی ڕووت و ڕەجاڵ کە تەنیا دەرپێقووتەکەی لە بەردا مابێت. لە بەردەم مندا سکاڵات کردووە و گریاویت، لە بارەی گیروگرفتەکانی خۆتەوە بۆم دواویت، بێباکانە لە ئەوین و خەمینی و هیواکانت ئاگادارت کردووم. دەتناسم و تێت دەگەم. ئێستا بۆت دەگێڕمەوە کە تۆ چۆن و چیت، پیاوی بچووک! چونکە ڕاستییەکەی باوەڕم بە داهاتوویەکی گەورە هەیە بۆت. داهاتوویەک کە هیچ گومانێکی تێدا نییە کە تەنیا داهاتووی تۆیە و بەس. کەواتە، بەر لە هەموو شتێک، سەیرێکی خۆت بکە، لە خۆت ورد ببەرەوە، وا خۆت ببینە کە هەیت! گوێ بگرە لەوەی کە یەکێک لە ڕابەرەکانت یا نوێنەرەکانت دوور نییە پێت بڵێت: "*تۆ، پیاوێکی ئاسایی، پیاوێکی بچووکیت.*" هەوڵ بدە لە نێوەڕۆکی ئەم دوو پەیڤە، "ئاسایی" و "بچووک" بگەیت!

ڕامەکە! بوێرە و سەیرێکی خۆت بکە!

دەڵێیت: "بە چ هەقێک ئەم شتانەم پێ ڕادەگەیەنیت!"

ئەم پرسە لە چاوە پڕ لە ترسەکانتدا دەبینم. ئەو پرسەی هێزی لە بەر بڕیویت و تۆقاندویتی، گرگن! لەوە دەترسیت سەیری خۆت بکەیت، لە ڕەخنە دەترسیت، پیاوی بچووک! لەو دەستەڵاتەی

پەیمانت پێ دراوە بتدرێتێ دەترسیت، چونکە دڵنیایت کە نازانیت چۆن ئەو دەستەڵاتە بە کار بهێنیت. قەت ناوێریت بیر لەوە بکەیتەوە کە دەتوانیت خۆت بە جۆرێکی جیاوازتر ببیت لەوەی کە هەیت؛ سەربەست لەبری سەرنەوی، ڕاستگۆ و کراوە لەباتی فێڵباز و خۆویست، ئامادە بۆ ئەوەی بە ڕۆژی ڕووناک خۆشەویستی بکەیت نەک بە دزی و ملهوورانە لە تاریکەشەودا.

تۆ ڕقت لە خۆت دەبێتەوە، پیاوی بچووک! خۆت خۆش ناوێت.

بە خۆت دەڵێیت: *"من کێم تا ڕا و بۆچوونی خۆم هەبێت، چیم تا بتوانم جڵەوی ژیانی خۆم بگرمە دەست خۆم و ڕابگەیەنم کە ئەم دنیایە هی منە؟" ڕاست دەکەیت، "تۆ چیت، تا بتوانیت مانایەک بە ژیانت بدەیت و جڵەوی بوونی خۆت بگریتە دەست خۆت؟"*

من بۆت دەگێڕمەوە کە تۆ کێیت.

تۆ، بە شتێک لەگەڵ مرۆڤێکی گەورە، مرۆڤێک کە بەڕاستی گەورەیە، جیاوازییت هەیە. ئەو مرۆڤە گەورەیەیش سەردەمانێک وەک تۆ بچووک بوو، بەڵام بۆ ئەوەی لە دەست ئەو بچووکییە ڕزگاری ببێت، تاکە یەک سیفەت لە سیفەتەکانی خۆی بەرەو باشتربوون گۆڕی. خۆی فێر کرد چۆن خاڵە لاوازەکانی خۆی، چ لە بیرکردنەوە و چ لە هەڵسوکەوتدا، بناسێت و دەستنیشانیان بکات. لەژێر پاڵەپەستۆی بەردەوامی گیروگرفتەکانیدا، خۆی فێر کرد کە چۆن هەستکردن بە خۆبەبچووکزانین و لەژێرەوەبوون هەڕەشە لە بەختەوەربوونی دەکات. بە واتایەکی تر، مرۆڤی گەورە دەزانێت چۆن و لە چ هەلومەرجێکدا دەبێت بە پیاوێکی بچووک، بەڵام پیاوە بچووکەکە لەوە بێئاگایە کە بچووکە و لەوەیش دەترسێت لە بچووکیی خۆی ئاگادار بکرێتەوە. بچووکی و بێقیمەتیی خۆی لە پشت ئەو خەون و خەیاڵانەوە حەشار داوە کە لە بەهێزی و باڵادەستیی کەسانی تردا، هێز و گەورەیی بۆ دەگەڕێننەوە. لەبری ئەوەی شانازی بە خۆیەوە بکات، شانازی بە

سەرداره مەزنەکانیەوە دەکات. لە بەردەم ئەو ڕا و بۆچوونانەدا دێتە سەر چۆک کە قەت بە بیری خۆیدا نەهاتوون، نەک ئەوانەی خۆی بە ڕەنج و تەقەلای خۆی پێیان گەیشتووە. تەواوی بڕوا و بوونی خۆی بەو شتانە سپاردووە کە یا هەر تێیان ناگات یا کەمێک تێیان دەگات. تا زیاتر لە بیر و بۆچوونێکیش تێ بگات، کەمتر باوەڕی پێ دەکات.



*خۆت سەروەری کۆیلەیەتیی خۆتی.*

ئێستا لە پیاوە گرگنەکەی ناخی خۆمەوە دەست پێ دەکەم.

بیستوپێنج ساڵی ڕەبەق، بە نووسین و پەیڤین، بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەرییت لەم دنیایەدا، بەرگریم لە مافی تۆ کرد؛ سەرزەنشتی

ئـەوەم کردیت کە توانای ئـەوەت نییە ئـەو شتانە بخەیتە ژێر ڕکێفی خۆت کە هی خۆتن. گلەیی و گازندەم کرد لە کارامەییت لە نەپاراستنی ئەو دەستکەوتانەدا کە لە ڕەوتی شەڕە خوێناوییەکاندا، لە سەنگەرەکانی پاریس و ڤییەنا کەوتبوونە ژێر ڕکێفت، یا ئەو سەرکەوتنانەی لە ڕەوتـی ڕزگاریکردنی ئەمەریکا و لە کاتی شۆڕشی ڕووسیادا بە دەستت هێنابوون. ئاکام پاریست بە پێتاین و لاڤال، ڤییەنات بە هیتلەر، ڕووسیات بە ستالین کۆتایی هات و ئەمەریکایشت، دوور نییە بە ڕێژیمێکی ژێر چنگی کو.کلوکس. کلان کۆتایی بێت. زیاتر لەوەدا لە پێشەوە بوویت و سەرکەوتیت کە سەربەستی بە دەست بهێنیت، نەک لـەوەدا کە بەرگری لە بەردەوامبوون و مانەوەی بکەیت، چ بۆ خۆت و چ بۆ خەڵکانی دەوروبەرت. زۆر دەمێک بوو لەمانە بە ئاگا بووم، بەڵام ئەوەی لێی بێئاگا بووم و نەمدەزانی ئەوە بوو کە بۆ هەر کاتێک توانیبێتت لە قۆرتی کلۆڵییەک خۆت ڕزگـار بکەیت، کەوتویتەتەوە چاڵی کلۆڵییەکی لەو خراپترەوە! بە کاوەخۆ، بەڵام بەوپەڕی دڵنیاییەوە، ئەو هۆکارەم دۆزییەوە کە تۆی کردۆتە کۆیلە، تۆ خۆت *سەروەری کۆیلەیەتیی* خۆتی. کەسی تر نا، خۆت! ئەمە هەقیقەتەکەیە، بێجگە لە خۆت، کەسێکی تر بەرپرسیاری کۆیلەیەتیی تۆ نییە.

ئەمە شتێکی تازە بوو بۆ تۆ، وا نییە؟

ئەوانەی بە ڕزگاربوونتدا هەڵدەڵێن، پێت دەڵێن: "داپلۆسەرەکانت ویلیەم، نیکۆلاوس، پاپا گریگۆریی بیستوهەشتەم، مۆرگان، کرۆپ و فـۆردن." پێت دەڵێن: ڕزگارکەرانی تۆ مۆسۆلینی، ناپۆلیۆن، هیتلەر و ستالینن."

منیش پێت دەڵێم: "بە تەنیا خۆت، ڕزگارکەری خۆتی! بە تەنیا خۆت و کەسی تر نا!"

مـن، بڕوایەکی تـەواوم بـەم ڕاستییە هەیە. منێک کە خـۆم بە خەباتگێڕێک دەزانم لە پێناوی پاکێتی و ڕاستیدا، بەڵام ئێستا کە

مەسەلەکە پێوەندی بە تۆوە هەیە تا هەقیقەتەکە دەرهەق بە خۆت بزانیت، دوودڵم، چونکە دەسڵەمێمەوە و دەترسم لێت کاتێک بیر لەوە دەکەمەوە چۆن و بە چ جۆرێک دەڕوانیتە هەقیقەت و بیری لێ دەکەیتەوە. هەقیقەت، هەر ئەوەندەی پێوەندی بە تۆوە هەبێت، تۆقێنەرە. بەڵام هەقیقەت دەکرێت تەندروستیش بێت، هەرچەند دووریش نییە هەر نەگریس و ناکەسبەچەیەک لێی ڕاست ببێتەوە و بیەوێت زەوتی بکات بۆ خۆی. ئەگەر وا نەبووایە، نە تۆ لەو جێیەی خۆتدا دەبوویت و نە ئەوەیش دەبوویت کە هەیت.



*بە تەنیا خۆت، ڕزگارکەری خۆتی و کەسی تر نا!*

ئەقڵم پێم دەڵێت: "هەقیقەتەکە بدرکێنە، با زۆریش لەسەرت بکەوێت." پیاوە بچکۆلەکەی ناخیشم دەڵێت: "خۆ خستە بەر دەست و خۆدانەدەست پیاوە بچووکەکە دەبەنگییە. ئەو نایەوێت گوێ بۆ ئەو ڕاستییانە بگرێت کە لە بارەی خۆیەوەن. بخوازێت یا نا، ئەو بەرپرسییە مەزنە ڕەت دەکاتەوە کە هی خۆیەتی و خولیای بەدەستهێنانی نییە. دەیەوێت یا هەر بە گرگنی بمێنێتەوە یا ببێت بە پیاوێکی گەورەی گرگن. ئەو دەیەوێت ببێت بە خاوەن موڵک و ماڵ، ڕابەری پارتییەک، بەڕێوەبەری ڕێکخراوەی ئەوانەی لە جەنگەکاندا قاڵبوون، یا ببێت بە دەمڕاستی ئەو دامەزراوەیەی بە بەرزکردنەوەی ڕەوشتی باوەوە خەریکە، بەڵام نایەوێت بەرپرسیی ئەو ئەرکانەی لە ئەستۆیدان سەبارەت بە کار، دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیان، بیناکردنی خانووبەرە، هۆیەکانی هاتوچۆ، پەروەردە و زانین، کۆڵینەوە و توێژینەوە و کارەکانی تری بەڕێوەبردنەوە، یا هەر کارێکی تری گرنگەوە، بگرێتە خۆ."

پیاوە بچووکەکەی ناخم دەڵێت: "تۆ بوویت بە مرۆڤێکی گەورەی ناسراو لە سەرانسەری ئەڵمانیا، نەمسا، سکەندناڤیا، ئینگلستان و فەلەستیندا. کۆمۆنیستەکان لە دژت ڕاوەستاون، "دامەزراوەی پاراستنی میراتی فەرهەنگی" ڕقی لێت دەبێتەوە. خوێندکارەکانت خۆشیان دەوێیت و ئەو نەخۆشانەی چارەسەرت کردوون، بە چاوی ڕێز و پێزانینەوە سەیرت دەکەن. مرۆڤە نیازپیسەکان، ئەو مرۆڤانەی نەخۆشیی چاوەقووڵکە لە پەلوپۆی خستوون، ڕاوت دەنێن. چەندان کتێب و وتاری هەمەچەشنەت لەبارەی نەگبەتیی ژیان و کلۆڵیی پیاوی بچووکەوە نووسیووە. کارە زانستییەکانت، تێگە و دۆزینەوەکانت، لە زانکۆکاندا دەوترێنەوە و مرۆڤانی گەورەی تر؛ پیاوانی بەلاوەنراو و بەتەنیاجێهێڵراو، دەڵێن: "تۆ مرۆڤێکی گەورە و پایەبڵندی، لەتەک زانا مەزنەکانی بوارە جیاجیاکانی زانستەکاندا ناوت دەهێنرێت. خاوەنی گەورەترین دۆزەوەی زانستیی تەواوی چاخەکانیت، وزەی ژیان و یاساکانی زیندووێتی و نەمریی ئەو وزەیەت دۆزیوەتەوە! تێگەیەکی نوێت لە

بارەی نەخۆشیی شێرپەنجەوە هێناوەتە ئاراوە، لەمەڕ هەقیقەتەوە دواویـت، بۆیە وڵاتـە و وڵات لە دوت کەوتوون و ڕاونراویت. شایانی ئـەوەی بە دەستت هێناوە، لەبەر ئەوە هەقتە تاموچێژ لەو ناوبانگ و سەرکەوتنانە ببینیت، کە بە دەستت هێناون. لە داهاتوویەکی نزیکدا ناوت دەکەوێتە سەر زاران و ناوبانگت بە هەموو لایەکدا دەنگ دەداتـەوە. زۆر کارت ئەنجام داوە، ئارام بگرە و تەواوی کاری خۆت، بە پشتبەستن بە یاسا بنچینەییەکانی سروشت، بدە بە کار و لێکۆڵینەوەکانت.“

ئەمەیە، ئەو شتانەی پیاوە بچووکەکەی ناخم پێم دەڵێت، ئەو پیاوە بچووکەی لێت دەترسێت و تۆقیوە لێت، گرگن!

سەردەمێکی دووردرێژ، لە نزیکەوە، پێوەندیم لەگەڵتدا هەبوو، چونکە ژیانی تۆم لە ژیانی خۆمدا دەبینیەوە، چونکە دەمویست یارمەتیت بدەم. ئەو پێوەندییەم لا گرنگ بوو، دەمپاراست، چونکە دەمبینی دەستی یارمەتیم دەتگەیشتێ و بە هاناتەوە دەهات، تۆیش ئەو یارمەتییەت بە چاوی پڕ لە گریانەوە قەبووڵ دەکرد. بەرەبەرە ئەوەم لا ئاشکرا بوو کە دەتویست ئەو یارمەتییە وەربگریت، بەڵام ناکامڵ بوویت لەوەدا بتوانیت لەسەری بێیتە دەنگ و بیپارێزیت. ناچار خۆم لەبریی تۆ دەمپاراست و لەسەری بە دەنگ دەهاتم، شێلگیرانەیش لە پێناوی تۆدا دەجەنگیم. ئەوکات ڕابەرەکانت، پێشەواکانت، هاتن و کارەکەیان لە بنەڕەتەوە تێکدا، تۆیش بێدەنگ و بێ ئـەوەی ورتەیەکت لێوە بێت، بوویت بە ئەڵقەلەگوێیان و دوایان کەوتیت.

ئێستایش، ئەو پێوەندییەی خۆمم لەگەڵتدا هەر پاراستووە، بەو مەبەستەی فێر ببم چۆن کەسێک دەتوانێت دەستی یارمەتیت بۆ درێژ بکات، بێ ئەوەی ڕەنجبەخەسار بێت، جا چ وەک ڕابەر یا وەک قوربانی. پیاوە بچکۆلەکەی دەروونم، دەیویست بە سەروەری بتبینێت، دەیویست، “ڕزگارت بکات“ بە هەمان ڕێز و حورمەتەوە تێی بڕوانیت کە لە “زانایەکی ماتماتیک“ دەڕوانیت، هەرچەندە

هیچ ئاگاداری و زانیارییەکت لە بارەی توان و لێهاتوویی ئەو زانای ماتماتیکەوە نییە. تۆ تا کەمتر تێ بگەیت، ترسێکی زیاتر و پڕ لە ڕێز و بەماناتر پیشان دەدەیـت. تۆ هیتلەر چاکتر لە نیتشە، ناپۆلیۆن چاکتر لە پێستالۆتسی دەناسیت. بۆ تۆ پادشایەک لە فرۆید گرنگترە. پیاوە گرگنەکەی ناخم، هانم دەدات بە شێوە هەرە باوەکە، بەو جۆرەی سەروەرەکانت پشیپشیت بۆ دەکەن، بە دەستت بهێنم. لێت دەترسم، کاتێک پیاوە بچکۆلەکەی ناخم خەون بەوەوە دەبینێت “بەرەو سەربەستیبەدەستهێنان” ڕێبەریت بکات. تۆ دەتوانیت لە مندا خۆت و لە خۆتدا من بدۆزیتەوە. ئەو کارەیشت هێند بتتۆقێنێت، تا ئەو جێیەی کە لە ترساندا خۆت لەنێو مندا بکوژیت. هەر لەبەر هەمان هۆیش، چیی تر ئامادە نیم لە پێناوی سەربەستبوونتدا بمرم و ببم بە کۆیلەیەکی ملهوڕ و بەردەستی خاوەن کۆیلەکان. دەزانم تێ ناگەیت، دەزانم هیچ لەوە تێ ناگەیت کە هەنووکە پێم ڕاگەیاندیت. “سەربەستبوونت لەوەدا کە ببیت بە کۆیلەیەکی ملهوڕ و سووکی خاوەنەکانت” هەرچییەک بێت، دڵنیام لەوەی کە هەروا سانا و ئاسان نییە.




*کۆیلەی هەر کەسێک*

بۆ ئەوەی مرۆڤ لە کۆیلەیەکی بەوەفای تاکەخاوەنێکەوە بتوانێت ببێت بە *کۆیلەی هەر کەسێک*، پێویستە بەر لە هەر شتێک دەسەڵات، لە دەستەڵاتدارێکی داپڵۆسەر بسێنێتەوە. گریمان، ئەو دەستەڵاتدارە تسارە! ئەم شاکار و بوێرییە سیاسییەیش هیچ دەرئەنجامێکی نابێت ئەگەر چەند کەسێک نەکرێنە بتی سەربەستی و چەند هۆکارێکی هاندەری شۆڕشگێڕانەیش لە ئارادا نەبن، هەربۆیە مرۆڤ دەمنادەمێک، پارتییەکی شۆڕشگێڕ کە لە پێناو ئازادی و سەربەستیدا تێ دەکۆشێت، بە ڕێبەرایەتیی پیاوێکی بەهەق مەزن دەدۆزێتەوە. گریمان ئەو پیاوە مەسیح، مارکس، لنکۆڵن یا لێنینە. ئەو پیاوە مەزنەیش، بەوپەڕی بڕواوە، کێشەی ئازادبوونی تۆی وەرگرتووە و خەباتی بۆ دەکات. بۆ ئەوەیش بتوانێت دەرئەنجامێکی باش لەو کارەیدا بە دەست بهێنێت، ناچار دەبێت بەوەی چەندان پیاوی گرگن و هیچلەباردانەبوو بە چەشنی یاریدەدەر و جێگر لە خۆی کۆ بکاتەوە، چونکە بە تەنیا و تەنیاباڵ ناتوانێت بە ئەنجامدانی ئەو کارە مەزنە هەڵبستێت. تۆیش، سەرباری هەر شتێک، نەک تێی ناگەیت، بەڵکو هیچ گرنگییەکی پێ نادەیت، ئەگەر بێت و کۆمەڵێ پیاوی گزگل؛ ئەوانەی هیچ شتێکی تر نازانن بێجگە لە کاری ڕێکخراوەیەک زیاتر، لە دەوری نەبینیت. دەورەدراو بە کۆمەڵی پیاوی لەو چەشنە، دەستەڵات، یا پچێک هەقیقەت، یا هەر نەبێت بڕوایەکی تازەتر و چاکترت بۆ بە دەست دەهێنێت و دەیخاتە ژێر ڕکێفت. دواتر پەیامەکەیت پێ ڕادەگەیەنێت. چەند یاسایەکیش، تەنیا بە مەبەستی پاراستنی ئازادی و سەربەستیت، دەهێنێتە ئاراوە. بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەیش تەنیا پشتی بە تۆ و بە گیانی لەخۆبووردنی تۆ و یارمەتیت، بەستووە. لەو زەلکاوە کۆمەڵایەتییەی تێی کەوتوویت، قوتارت دەکات. بۆ ئەوەیش بڕوای پیاوە بستەباڵانی دەوروبەری خۆی لە دەست نەدات و لێی نەتەکنەوە، بۆ ئەوەی هەر بەردەوام بیت لەوەدا متمانەی پێ بکەیت و جێی بڕوات بێت، ناچارە پارچە پارچە دەستبەرداری گەورەیی و مەزنیی خۆتی بێت و بیکات بە قوربانی بۆ تۆ! گەورەیی و مەزنییەک کە تەنیا لە کاتێکدا لە باریدا

بوو کە دوور لە تۆ و لە جەجاڵ و غەڵبەغەڵبی ژیانی ڕۆژانەی تۆ، هاوکاتیش لە پێناوی تۆدا و بۆ ژیانی تۆ، کە بە قووڵی بەسەر دنیای تەنیایی خۆیدا ڕۆچووبوو، لە دەستی بدات. بۆ ئەوەیش بتوانێت ڕێبەرایەتیت بکات، ناچارە بەوەی بەرگەی ئەوەیش بگرێت بە جۆرێکی تر لە قاڵبی بدەیت و دایبتاشیت و بیکەیت بە خوایەکی وا کەس دەستی پێی نەگات.



*پیاوە گەورە گرگنەکە ـ kleinen GröBen*

ئەگەر بێت و بەردەوام بێت لەسەر ئەو سادەیی و ساکارییەی ژیانی پێشووی، ئەوا چیی تر نایکەیت بە جێمتمانەی خۆت و ئەو بڕوایەی پێشتر پێیت هەبووە لێی دەستێنیتەوە. ڕازی نیت بەوەی پیاوێکی سادە بێت، پیاوێک کە بتوانێت بێ ئەوەی پسوولەی مارەبڕینی ژنێکی پێ بێت، ئەو ژنەی خۆش بووێت.

بەم شێوەیە، سەروەرانی تر بۆ خۆت دەخوڵقێنیت. کاتێکیش پیاوە گەورەکە دەبێت بە سەروەرێکی ترت، هەرچی مەزنیی خۆی هەیە لە دەستی دەدات، چونکە مەزنیی ئەو لە سادەیی و ئازایەتی و پێوەندی بە ژیانی ڕۆژانەوە و لە خەمینی بەرەوپێشچووندایە و تۆیش بەوەی کە دەیکەیتە سەروەرێکی نوێ، ئەو سیفەتانەی لێ زەوت دەکەیت. پیاوە گرگنەکانیش؛ "ئەوانەی بێجگە لە کاری ڕێکخراوەیی شتێکی تر نازانن"، لە سایەی ئەودا دەست بەسەر هەموو کارە گرنگەکانی دارایی، زانستی، هونەر و کارەکانی تری بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا دەگرن، چ لە نێوخۆ و چ لە پێوەندییەکانی دەرەوەدا، تۆیش، تەنیا و جێماو، لەو زەلکاوەدا دەمێنیتەوە کە تیایدا بوویت.

شەکەت و ماندوو هەر بەردەوام دەبیت لە پێناوی بەدەستهێنانی "سۆسیالیستی داهاتوو!" یا "ڕایخی سێیەم"دا. بەردەوام دەبیت ئەو ژیانە نەگریسەی پێت ڕەوا بینراوە، لەنێو خانووە نیوەدارماوەکاندا؛ ئەو خانووانەی دیوارەکانی بە تەپاڵە سواخدراون، بە سەر ببەیت. هاوکاتیش، بەشانازییەوە، دەڕوانیتە ئەو کۆشکە ڕازاوانەی گەورەکانت بۆ پاراستنی میراتە فەرهەنگییەکەت دروستیان کردوون. بەوەی کە گوایا دەستەڵاتت هێناوەتە ژێر ڕکێفت، خۆشبەخت و خەنیت، تا هەڵگیرسانی جەنگێکی تر یا تا نووچدان و ژێرکەوتنێکی تری سەروەرە تازەکەت.

لە وڵاتە دوورەدەستەکاندا، پیاوە بچووکەکان، بە دووروودرێژی لەوە کۆڵیونەتەوە چ پێویستییەک پاڵت پێوە دەنێت، کە ببیتە کۆیلەی

هەر کەسێک بیەوێت. ئەوان بێ ئەوەی ڕۆشنبیرییەکی ئەوتۆییان هەبێت، بەبێ ئەوەی زۆر بەو کارەوە خەریک بووبن، ئەوەیان دۆزیوەتەوە کە پیاو چۆن دەتوانێت ببێت بە پیاوێکی مەزنی گرگن. پیاوە گەورە گرگنەکانیش؛ ئەوانەی ئێستا کردووتن بە سەروەر و ڕێبەرانی خۆت، پیاوانی ناو کۆشک و تەلار نین، بەڵکو ئەوانەن کە تا دوێنێ چۆن تۆ برسی و بارگران بوویت، ئەوانیش هەروەکو تۆ برسی و بارگران بوون، تەنیا ئەوە نەبێت کە ئەوان ڕێگایەکی کورتتریان دۆزییەوە بۆ ئەوەی ئاسانتر و خێراتر بتوانن سەروەرەکانیان بگۆڕن. چەندان سەدەیە، پیاوە گەورەکانی زانست و بیرکارە مەزنەکان، چییان لە دەست هاتبێت، چەندیان لە توانادا بووبێت، بۆ بەدەستهێنانی بەختیاری و ئازادبوونت، کردوویانە و لە هیچ قوربانیدانێک لە پێناوی خۆشبەختیی تۆدا درێخیان نەکردووە. پیاوە گرگنەکانی نێو ڕیزەکانی تۆیش، ئەو خۆبەختکردن و قوربانیدانەی ئەوانیان پێ هیچ بووە و بە پێویستیان نەزانیوە، هەربۆیە ئەوەی ئەو گەورەپیاوانە لە ماوەیەکی درێژخایەن و بە هەوڵ و تەقەلای بەردەوامیان ئەنجامیان داوە، ئەمان لە چاوترووکاندنێکدا تێکیان داوە و ڕیسەکەیان کردۆتەوە بە خوری. پیاوە بچکۆلەکەی نێو ڕیزەکانی تۆ کارەکەی هەر تەواو ئاسان کردووە و زۆر بێشەرمانە و بە ئاشکرا، لە بارەی تۆ و ژیانی تۆوە، لە بارەی منداڵەکانت و خێزانەکەتەوە، دەئاخڤێت و ڕادەگەیەنێت کە تۆ شایانی هەر سووکایەتییەکیت پێت دەکرێت، کە تۆ گەلۆر و دەبەنگیت، لە هیچ تێ ناگەیت و پیاو دەتوانێت چی بیەوێت، چۆن بیەوێت، پێت بکات و بتکات بە مەخسەرەی خۆی. ئەوان گفتی سەربەستیی نەتەوەییت دەدەنێ، نەک سەربەستبوونی کەسایەتیت. فێرت دەکەن چۆن لەبریی ڕێزگرتن لە مافە مرۆڤییەکانی خۆت، ڕێز لە دەوڵەت بگریت، فێرت دەکەن چۆن مەزنیی نەتەوەییت، لە مەزنیی کەسایەتیی خۆت لا گرنگتر بێت. چونکە تۆیش "مەزنی و سەربەستبوونی کەسایەتیی خۆتت" لا گرنگ نییە و لێت بووە بە تەمومژێک و بەری چاوانی گرتوویت، لەبەر ئەوە "سەربەستیی

نەتەوەیی“ و “پاراستنی هەقەکانی دەوڵـەت“ باڵت لێ دەڕوێنن و شاگەشکەت دەکەن. چۆن سەگێک بە بینینی ئێسکێک لیک بە قەپۆزیدا دێتە خوارەوە، تۆیش تەنیا هەر بە بیرکردنەوە لێیان بە مەرەی ئەو سەگە دەچیت، هەر بۆیەیشە بەردەوام شاباشیان دەکەیت و بە شانوباڵیاندا هەڵدەڵێیت. هیچ کام لەو پیاوە گرگنانە ئامادە نین ئەو نرخەی گیوردانۆ برونۆ، مەسیح، کارل مارکس و لنکۆڵن لە پێناو ئازادبوونتدا دایان، بیدەن. پیاوە پووتەکانی نێو ڕێکخراوە جۆربەجۆرەکانت، نەک خۆشیان ناوێیت، بەڵکو ڕقیشیان لێت دەبێتەوە، چونکە تۆ خۆت ڕقت لە خۆتە، گرگن! ئەوان زۆر چاک دەتناسن و لە هەموو لایەنە لاوازەکانی ژیانت بەئاگان، ئەو لایەنانەی کە دەبوو بە تەنیا خۆت لێیان بە ئاگا بوویتایە. ئەوان تۆیان کردووەتە قوربانی و تۆیش ئەو مافەت داونەتێ کە تۆ بندەست و ئەوان سەروەرت بن. تۆ ئەوانت بەرز کردووە و کردتن بە ڕێبەر و پێشەوایانی خۆت، هەرچەندە ئێستا بۆت دەرکەوتوون، بێ دەمامک و چۆن هەن، دەیانبینیت، بەڵام هەر بەردەوامیت لە پشتگیریی و یارمەتیدانیان. ئەوان، ڕووبەڕوو، ڕاست و بێ گرێ و گۆل، پێیان وتیت: “تۆ بوونەوەرێکی بندەست و نەگریسیت. بوونەوەرێکیت، کە هیچ هەست بە لێپرسینەوە ناکەیت و هەروایش دەمێنیتەوە.“ تۆیش، بە “ڕزگارکەرە نوێیەکان“ ناویان دەبەیت، دوایان کەوتوویت و لە هاتوهاواری خۆت ناکەویت و شاباشی سەروەرییان دەکەیت.

لێت دەترسم و تۆقیوم لێت، پیاوی بچووک! چونکە چارەنووسی نەوەکانی داهاتوو کەوتۆتە ئەستۆی تۆ و بە تۆوە بەندە. لێت دەترسم، چونکە ئامانجی هەرە سەرەکییت لە ژیاندا، هەڵهاتن و ڕاکردنتە لە خودی خۆت. تۆ نەخۆشی، نەخۆشێکی ترسناک، گرگن! پەتای ئەم نەخۆشییەت خەتای خۆت نییە، بەڵام قوتاربوون و چاکبوونەوە و تەندروستبوونت، بە تەنیا کەوتۆتە ئەستۆی خۆت. خۆت و کەسی تر نا!




*ڕزگارکەرە نوێیەکان!*

دەمێک بوو چەوسێنەرەکانت لێت دوور کەوتبوونەوە و دەستبەردات بووبوون، ئەگەر بە چەوسانەوە ڕازی نەبوویتایە و پشتگیریت لە مامەڵە و هەڵسوکەتیان نەکردایە. هیچ هێزێکی داپڵۆسەر، هیچ هێزێکی پۆلیسی، لە دنیادا نەبوو بتوانیت سەرت پێ نەوی بکات، ئەگەر لە ژیانی ڕۆژانەتدا نەختێک بە تەنگ ڕێزگرتنەوە بوویتایە لە خودی خۆت. ئەگەر بتزانیایە ـ لە ڕاستیشدا وایە ـ کە بێ تۆ ئەم دنیایە، تەنانەت بۆ ساتێکیش، ناتوانێت خۆ ڕابگرێت و بمێنێتەوە.

قەت ڕابەرەکەت ئەمەی پێ ڕاگەیاندوویت!

ڕابەرەکەت، بە "پرۆلیتاریای هەموو دنیا" ناوی دەبردیت، بەڵام هەرگیز پێی ڕانەگەیاندیت کە بە تەنیا خۆت لە ژیانی خۆت بەرپرسیاری. ژیانی خۆت، نەک سەربەرزی و ئابرووی وڵاتەکەت!

دەبێت لەوە تێ بگەیت، کە خۆت پیاوە پووتەکانت پەروەردە کرد و کردتن بە چەوسێنەرانی خۆت. مرۆڤە گەورەکان؛ مرۆڤە گەورە بەئەمەکەکانیشت، کردە قوربانی و ڕێگات بۆ گرگنەکان خۆش کرد لە خاچیان بدەن، بەردبارانیان بکەن و لە برسାندا بیانکوژن. دەبێت تێ بگەیت لەوەی کە قەت گوێت بەو مرۆڤانە نەدا و ئەو شپرزەیی و دوودڵییەی ئەوانت بە لاوە گرنگ نەبوو، کە بۆ تۆ و لە پێناوی ژیانی تۆدا دووچاری بووبوون. دەبێت تێ بگەیت لەوەی کە هیچ شتێک لە بارەی ئەو کەسانەوە نازانیت، کە بە دەنگ ژیانی تۆوە هاتن و دەیانویست دەستی یارمەتیت بۆ درێژ بکەن.

تۆ دەڵێیت: "بەرلەوەی بتوانم متمانەت پێ بکەم، دەبێت لە بۆچوون و ڕایەکانت سەبارەت بە ژیان ئاگادار بم."، بەڵام هەر کە گوێت لە ڕاوبۆچوونەکانم سەبارەت بە ژیان دەبێت، باڵ دەگرێت و بە پەلەپرووسکێ خۆت دەگەیێنیتە کن "دادوەرەکانت"، "پیاوەکانی دەوڵـەت"م لـێ تیژ دەکـەیـت، پـەنـا دەبیتە بـەر "دامودەستگا جۆربەجۆرەکانی پاراستنی ئاساییشی گشتی!" یا "ڕۆژنامە و گۆڤارە سووک و هەرزانەکان"م لێ هان دەدەیت. لەوەیش زیاتر، داوا لە "ڕابەرەکانی کرێکاران!" دەکەیت بە هاناتەوە بێن، یا هەر نەبێت سووک و ئاسان، لێم هەڵدێیت و خۆت لە چنگ تێڕوانین و بۆچوونەکانم دەرباز دەکەیت.

من، نە سوورم، نە ڕەش، نە سپی، نە زەردم، نە دیانم، نە جوولەکە، نە موسڵمان و لەسەر هیچ دینێکی تریش نیم. بڕوایشم بەوە نییە لە یەک کاتدا چەند ژنێکم هەبێت، نە هەتیوبازیشم، نە ئەنارکیست و کەسێکیش نیم بە دوای شەڕدا بگەڕێت. ژنەکەی خۆم لە ئامێز دەگرم، نەک لەبەر ئەوەی پسوولەی مارەبڕینیم لەنێو دەستدایە، بەڵکو لەبەر ئەوەی خۆشم دەوێت.

قەت لە مندال نـادەم، نە ڕاوەمـاسـی دەکـەم و نە ڕاوی ئاسک و کەڵەکێوی، بەڵام نیشانگرەوەیەکی کارامەم و بەوە خەنی و

دڵخۆش دەبم نیشانە بپێکم. نە خەریکی یاریی کاغەزم و نە کەسیش بانگ دەکەم بۆ ئەوەی گوێ بۆ ڕاوبۆچوونەکانم ڕادێرێت. ئەگەر بۆچوونەکانم ڕاست و دروست بن، بە خۆیان خۆیان بە خەڵک دەگەیەنن. ڕێگایش نادەم کارەکەم بکەوێتە ژێر چەپۆکی هیچ دەستەڵاتێکی تەندروستییەوە، ئەگەر پێم وا نەبێت لە خۆم بەتواناتر و لێهاتووتر و کارامەترە. خۆیشمم بڕیار دەدەم، کێن ئەوانەی لە دەرئەنجامی کارەکانم و دۆزینەوەکانم تێ دەگەن و کێن ئەوانەی تێی ناگەن. گوێڕایەڵم بۆ هەر خوو و نەریت و یاسایەک زیرەکانە و هۆشمەندانە داڕێژرابێت، هەر یاسا و نەریت و خوویەکیش کۆن بێت، بێهوودەیی و بێمانایی بپارێزێت، بەوپەڕی توانامەوە دژی دەوەستمەوە.

"ڕامەکە! پەنا بۆ "دادوەرەکـەت!" مەبە، پیاوی بچووک!، چونکە ئەویش ئەگەر نەختێک سـەرڕاست بێت، ئەگەر پچەک گیانی لەخۆبووردنی تێدا بێت، هەروەها دەکات."

من دەمەوێت منداڵان و لاوان ئەو بەختەوەرییە بدۆزنەوە کە سەراپای لەشیانی داپۆشیوە و خۆشەویستی بکەن، بەبێ هیچ ئاستەنگ و ڕێگرێکیش تامی لێ ببینن. پێم وا نییە مرۆڤ بۆ ئەوەی ببێت بە دینداریکی پاک و ڕاستەقینە، دەبێت ناچار بێت دەست لە خۆشەویستیی خۆی بۆ ژیان هەڵبگرێت، یا دوورەپەرێز لە تاموچێژی ژیان، ڕەقوتەق و وشکهەڵاتوو بمێنێتەوە، ناچار بێت بەوەی تا ڕادەی بۆگەنبوون دەست لە لەش و گیانی خۆی بەر بدات.

دەزانم ئەوەی ناوت لێناوە "خوا" لە ڕاستیدا هەیە و نکوڵی لە بوونی ناکرێت، بەڵام بە شێوەیەکی جیاواز لەوەی تۆ بە بیرتدا دێت. "خـوا" وزە بنچینەیی و دەرەکییـەکەی نێو گەردوونە، خۆشەویستیی نێو لەشی خۆتە، پاکی و ڕاستگۆیی و لەڕوویە، هەست و نەست و تێگەیشتنەکانتە بەرانبەر سروشتی ناوەوە و دەرەوەی خۆت.

پێم دەکرێت بە هەر هۆیەک بێت؛ گرنگیش نییە هۆیەکی لاواز یا بەهێز، ئەو کەسە بکەمە دەرەوە کە خۆی لە کارەکەم هەڵدەقورتێنێت؛ لە کاتێکدا بە پەروەردەکردنی منداڵانەوە، یا ئەو دەمەی مینا پزیشکێک لەگەڵ نەخۆشەکانمدا خەریکم، ئەگەر لەسەر ئەوەیش بدرێم بە دادگا چەند پرسیارێکی ئەوەندە ئاسان و ئاشکرای لێ دەکەم، کە قەت نەتوانێت بەرسڤیان بداتەوە، بێ ئەوەی تا لە ژیاندا ماوە لە ڕووی بێت لە تەریقیدا سەری خۆی هەڵبڕێت. من مرۆڤێکی کارگەرم، مرۆڤێک کە ناخ و دەروونی ئینسان دەناسێت و لێی بەئاگایە. مرۆڤێکم کە خۆی دەناسێت و دەیەوێت "کار" نەک "تێڕوانین و تێگەیشتن لە کار" دنیا بەڕێوە بەرێت. تێگە و بۆچوونی خۆم هەیە، دەتوانم درۆ لە ڕاستی جیا بکەمەوە و ئەم توانستەیش بۆم بووە بە کەرەستەیەک، کە شەو و ڕۆژ، سات لە دوای سات، بە کاری دەهێنم و دوای هەموو بەکارهێنانێکیش خاوێنی دەکەمەوە و پاک ڕایدەگرم.

لە قووڵایی دڵمەوە لێت دەترسم، گرگن! لێت دەترسم، بەڵام منیش ئاوها نەبووم کە ئێستا هەم. منیش، لەنێو ملیۆنان پیاوی بچووکی تردا، پیاوێکی بچووک بووم؛ بەڵام بە خەریکبوونم لە بوارە زانستییەکاندا و بە هەوڵ و تەقەلای خۆم لە بواری زانستی دەروونناسیدا، فێربووم بتبینم کە چەندە نەخۆشیت و نەخۆشییەکەیشت چەند تۆقێنەرانە کاری تێکردوویت. فێربووم ئەوە ببینم کە دەستەڵاتێکی لە سەروو خۆتەوە نییە، بەڵکو نەخۆشییە قورسە دەروونییەکەتە کە لەگەڵ تێپەڕبوونی هەر ڕۆژێک، هەر ساتێکدا، زیاتر سەرت پێ نەوی دەکات و لە پەلوپۆی خستوویت. تەنانەت ئەو کاتانەیش کە هیچ دەستەڵاتێکی دەرەکی لە سەرووی خۆیشتەوە لە ئارادا نەبووە. ئەگەر لە ناخەوە نەخۆش نەبوویتایە، ئەگەر تەندروست بژیایتایە، زۆر دەمێک بوو لە چنگ زاڵمەکانت قوتارت بووبوو. جاران چەوسێنەرەکانت لە توێژی سەرەوەی کۆمەڵ بوون و ئێستا ئەوانەن کە لە توێژەکەی خۆتن و لە خۆیشت بچووکترن، گزگل!، ئەوانەن کە بەشێکی گەورەیان لە بچووکی

بە دەست هێناوە و بە ئەزموونی خۆیان توانیویانە لە کلۆڵی و هیچلەباردانەبوویت شارەزا بن، تا بتوانن ئەزموونەکانی خۆیان لەو بوارەدا بە کار بهێنن و زیاتر و زاڵمانەتر بتچەوسێننەوە.

تۆ هیچ هەستێکت نییە و ئینسانە گەورەکە نابینیت! بوونی ئەو، قوربانییەکانی، تاسە و ئـارەزووی، حەز و ئەوین و خەباتی، بە تۆ نامۆن. تێناگەیت کە ژن و پیاوانی وا هەن لە توانستی خۆیان ڕانابینن، سەرت پێ نەوی بکەن و بتچەوسێننەوە. تێناگەیت کە کەسانی وا هەن دەیانەوێت ئازاد بیت و سەربەستیی ڕاستەقینەیان بۆت دەوێت. ئەو پیاو و ژنانەت خۆش ناوێت، چونکە غەریبن بەو شێوە ژیانەی بۆ خۆتت هەڵبژاردووە. ئەوانە کەسانی سادە و بێگرێوگۆلن. کەسانێکن، وەک تۆ چۆن فێڵ و کەڵەکت لا بەنرخە، ئەوان ڕاستییان لا بەنرخە. ئەوانە دەتبینن و دەڕواننە چارەنووسی تۆ؛ چارەنووسی مرۆڤ. تۆ هەست دەکەیت سەیر دەکرێیت، بۆیە ترس دایگرتوویت و شپرزە بوویت. تەنیا کاتێک دان بە مەزنیی ئەواندا دەنێیت کە چەندانی تری گرگن پێت دەڵێن: "ئەوانە مرۆڤی گەورەن." لە نزیکیی مرۆڤە گەورەکان لە ژیانەوە و لە خۆشەویستییان بۆ ژیان دەترسیت، بەڵام ئینسانە گەورەکان تۆیان خۆش دەوێت، هەر نەبێت لەبەر ئەوەی گیانەوەرێکی زیندوو و بوونەوەرێکی زیندوویت. مرۆڤە گەورەکان نایانەوێت چۆن هەزاران ساڵە دەناڵێنیت، هەروەها بمێنیتەوە. نایانەوێت، چۆن تا ئێستا کە بوویت، هەر بەردەوام بیت لەسەر فڵتەفڵت و بۆڵەبۆڵ. ئینسانی گەورە نایەوێت تۆ گیانەوەرێکی بارلێنراو بیت، چونکە ژیانی خۆش دەوێت و دەیەوێت ئـازاد و سەربەست و دوور لە هەر ناڵین و بێئابروویییەک، بتبینێت. تۆ مرۆڤە گەورەکان بە مەرەیەک دەبەیت، دەیانگەیەنیتە ڕادەیەکی وا، ڕقیان لێت ببێتەوە و دەموچاویان لە خەمینیدا ون بکەن و بە دەست تۆ و نزمیتەوە ئازار بچێژن و لێت هەڵبێن. ئەگەر ڕێکەوت دەروونناسێک بیت، ئەوا ئینسانی گەورە بە "شێتی" یا "لەڕێلادان" تاوانبار دەکەیت، چونکە ئینسانی گەورە تۆ نییە، تا ئامانجی ژیان لە کەڵەکەکردنی سەروەت و سامان، لە دۆزینەوەی ژیانی گونجاو و

لەبار و بە دڵی کۆمەڵ بۆ کچەکانی، یا لە بەدەستهێنانی پلەوپایەی سیاسی یان ئەکادیمیدا، ببینێت. هەر لەبەر ئەوەیش کە لە تۆ ناچێت، یا بە "بلیمەت" یا بە "گەلۆر" ناوی دەبەیت. ئەویش، لای خۆیەوە، ئامادەیە ئەوە بسەلمێنێت کە "بلیمەت" نییە، بەڵکو بوونەوەرێکی زیندووی ئاساییە و هیچی تر. بە "ناکۆمەڵایەتی" ناوی دەبەیت، چونکە ئەوەی پێ باشترە لەگەڵ بیرەکانی خۆیدا بە تەنیا بمێنێتەوە، نەک تێکەڵ بە بەزم و ڕەزمە پڕ لە فڵتەفڵت و بێماناکانی تۆ ببێت.



*ئاهەنگە کۆمەڵایەتییە پڕ لە فڵتەفڵت و بێماناکانت*

بە "شێت" ناوی دەبەیت، چونکە ئەو لەبریی کڕینی پشک لە دامەزراوە و کارگە هاوبەشەکاندا پارەکانی لە بواری بەجێهێنانی کارە زانستییەکاندا بە کار دەهێنێت. بە بەراورد لەگەڵ خۆتدا، لەبەر ئەوەی خۆت کەسێکی ئاسایی و باوی نێو کۆمەڵەکەتیت، ئەو مرۆڤە سادە و لەڕووە بە "نائاسایی" ناو دەبەیت. بە سڵەمینەوەوە بە قەد خۆت و بە قەد ئەو پێوانانەی بۆ ئاساییبوونت داناون دەیگریت

و بۆت دەردەکەوێت کە داواکانت ناهێنێتە دی. تۆ نایبینیت پیاوی بچووک! ناتەوێت لەوە تێ بگەیت کە ئەو مرۆڤە گەورەیەی خۆشی دەوێیت و دەیەوێت یارمەتیت بدات بە چ مەرەیەک بردووە، بە جۆرێک کە دوور کەوتۆتەوە لە هەموو پێوەندییەکی کۆمەڵایەتی، چونکە ژیانت لە هەموو شوێنێک کردۆتە شتێک کە هیچ کەس ناتوانێت خۆی لە بەردا بگرێت.



*لەبریی ئەوە لە خۆت دەپرسیت ئاخۆ دراوسێیەکانت چی دەڵێن، یا دڵاوایی و دەستنەقووچاندنت چەندی تێ دەچێت.*

کێ ئەو مرۆڤەی، دوای چەندان ساڵ ئازارچەشتن و ئێشی دڵتەزێن، بەو مەرەیە برد و کردی بەو مرۆڤەی ئێستا!؟

هەست بە لێپرسینەوە نەکردن و ناجۆریی بیرکردنەوە و خۆتێهەڵقورتاندنی تۆ، "ڕاستییە ئەبەدییەکان"ی لای تۆ وایلێکرد، کە هیچیان لە بەردەم گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکاندا، بۆ ماوەیەکی کەمیش، خۆی ڕاناگرێت. بیر لەو شتانە بکەرەوە کە لەنێوان هەردوو جەنگە جیهانگرەکەدا بانگەشەت بۆ دەکردن و سوێندت دەخوارد کە ڕاستن! چەندیان ڕاست دەرچوون و چەندیان هەڵە و دانت پێدا نا کە هەڵە بوون! چەند خۆت کرد بە خاوەنیان؟

بەوپەڕی دڵنیاییەوە هیچیان، پیاوی بچووک! هیچیان!

ئینسانی گەورە، بە وریاییەوە، بیر دەکاتەوە؛ بەڵام کە دەستی لە چمکی بیرکردنەوەیەکی گرنگ گیر بوو، بەری نادات و بەردەوام دەبێت لەسەر لێکۆڵینەوەی. تۆیت، پیاوی بچووک! کاتێک بیرکردنەوەکانی ئینسانی گەورە ڕاست و مژدەبەخشن، دەربەدەری دەکەیت و دەریدەپەڕێنیت، چون بیرکردنەوەکانی خۆت هیچوپووچ و بێکەڵک و کەمخایەنن؛ کە دەریشت کرد، تۆوی تەنیاییەکی ترسهێن، تۆوی دوورەپەرێزی لە ناخیدا دەچێنیت؛ نەک تەنیاییەک کە بەرهەمی سوودبەخش و بەکەڵکی لێ بکەوێتەوە، بەڵکو تەنیایی و ترسێک کە ببێت بە مایەی تێنەگەیشتن و ئازاردانت بۆی، چونکە تۆ "خەڵک"یت، "بیر و تێڕوانینی باو"یت، "ویژدانی کۆمەڵایەتی"ت.

بەڕاست! قەت بیرت لەوە کردۆتەوە ئەمە چ بەرپرسیارییەکی گەورەیە، بیرت لەوە کردۆتەوە چی دەکەیت؟ قەت لە خۆت پرسیوە، لە بەردەم گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانی داهاتوودا، لە بەردەم سروشتدا، لە بەردەم دەستکەوتە مەزنەکانی مرۆڤایەتیدا، چەند بەرپرسیاریت و تا چ ڕادەیەک ڕاست یا هەڵە بیر دەکەیتەوە؟ نا پیاوی بچووک! تۆ قەت لە خۆت نەپرسیوە ئاخۆ بیرکردنەوەکانت

هەڵەن یا ڕاستن؟ هەمیشە خەمی ئەوەت بووە دراوسێیەکەت چۆن دەڕوانێت و چۆن لە کردارەکانت دەپرسێتەوە، یا خەمی ئەوەت بووە دڵاوایی و دەستنەقووچاندن چەندی پارە تێدەچێت. لەمە زیاترت لە خۆت پرسیوە، پیاوی بچووک!

دوای ئەوەی ئەو ئینسانە گەورەیەت بەرەو دنیای تەنیایی دەرپەڕاند، لە بیرت چووەوە چ کارێکت کردووە و هەر بەردەوام بوویت لەسەر قسە پڕوپووچەکانت و دەستت لە فێڵ و ساختە هەڵنەگرت، بوویت بە مایەی ئێش و ژانێکی قووڵتر بۆی. تۆ بیرت دەچێتەوە، بەڵام مرۆڤی گەورە لە بیر ناچێتەوە و هەوڵی تۆڵەسەندنەوەیش نادات. لەبریی ئەوە هەوڵ دەدات تێ بگات بۆ وا کلۆڵانە هەڵسوکەوت دەکەیت. دەزانم ئەمەیش بە تۆ نامۆیە و تێی ناگەیت، بەڵام بڕوام پێ بکە ئەگەر چەندان جاری تریش ببیت بە مایەی ئازاردانی، نەک هەر ئەوەندەیش، ئەگەر ببیت بە مایەی بریندارکردنی بە جۆرێکی وا کە قەت جێبرینەکانی سارێژ نەبن ـ ئەگەر لە هەمان کاتیشدا نەزانیت چ کارێکت کردووە ـ ئەو مرۆڤە گەورەیە هەر لەبریی تۆ بە دەست کارە نابەجێیەکانتەوە ئێش و ئازار دەچێژێت؛ نەک لەبەر ئەوەی ئەو کارە ناپەسەندانەت بەنرخ و پڕمانان، بەڵکو لەبەر ئەوەی بچووک و بێنرخن.

مرۆڤی گەورە دەیەوێت لەوە تێبگات کە چییە وای لێ دەکات بە خراپە ناوی ژنەکەت، یا پیاوەکەت، بەریت، کاتێک نائومێدت دەکات و داواکانت بە جێ ناهێنێت. چییە وات لێ دەکات لەبەر ڕاگرتنی دڵی دراوسێ تووڕەوتڕۆکەت، ئازاری منداڵەکانت بدەیت. چییە وات لێ دەکات هاوڕێیەکەت فریو بدەیت، بەرۆکی مرۆڤێکی دڵپاک کە دەستی یارمەتیت بۆ درێژ دەکات، بەر نەدەیت تا لە پێناو مەرامەکانی خۆتدا بە کاری دەهێنیت. هەوڵ دەدات لەوە تێ بگات چی وات لێ دەکات پشت بۆ قامچییەکانت نەوی بکەیت. "بەوە ڕازی بیت کە پێت دەدرێت و ئەوەیش کە داوات لێ دەکرێت بە نابەدڵی و نەویستی و ناچاری بیدەیت!" دەیەوێت لەوە تێبگات چی وات لێ دەکات، دواشەق لە پاشەڵی ئەو مرۆڤەی ئەژنۆی بۆ

نووچدان دەلەرزێت هەڵبدەیت و پێ بەو مرۆڤەیشدا بنێیت کە لە بەردەمتدا کەوتووە. چی وات لێ دەکات لەبریی ڕاونانی درۆکان و خۆدوورخستنەوە لێیان، ڕاستییەکان ڕاو بنێیت و لێیان دوور بکەویتەوە.

تۆ هەمیشە لە بەرەی ئەوانەدایت لە ڕاستییەکان دەسڵەمێنەوە و دژایەتییان دەکەن، گزگل!



*میکرۆبە دەردهەڵگرەکانی نێو هەوا.*

مرۆڤە گەورەکە بۆ ئەوەی خواست و ویستەکانت، ئەو دۆستایەتییەت کە کەڵکی هیچ ناگرێت، بە دەست بهێنێت؛ ناچارە خۆی لەگەڵ داواکانی تۆدا، لەگەڵ تۆدا، ڕابهێنێت؛ ناچارە ئەو شتانە بلێتەوە کە گوێیەکانی تۆ پێیان ڕاهاتوون؛ ناچارە خۆی بەگوێرەی ئەو کارانە ڕاست بکاتەوە کە ئەنجامیان دەدەیت، بەڵام ئەگەر ئەویش خاوەنی شاکارەکانی تۆ بێت و زمان و پەیڤەکانی تۆ بە کار بهێنێت و بەو جۆرەی تۆ دۆستایەتی و هاوڕێیەتی بکات، دەبێت بەوەیش ڕازی بێت چیی تر مینا مرۆڤێکی گەورە و سادە و ڕاستگۆ نەمێنێتەوە. بەڵگەیش: هاوڕێیەکانتن! ئەوانەی چۆنت بوویت وا دەپەیڤن و قەتیش ئینسانی گەورە نەبوون.

تۆ پێت وا نییە هاوڕێیەکانت بتوانن کاری گەورە ئەنجام بدەن. بە دزیشەوە بێت، ڕقت لە خۆت دەبێتەوە؛ تەنانەت ئەو کاتانەیش، یا ـ بەتایبەت ئەو کاتانەیش ـ کە لە سەروو ئەو نرخەوەی هەتە خۆت دێتە پێش چاو. هەر لەبەر ئەوەیش کە ڕقت لە خۆت دەبێتەوە، لە تواناتدا نییە ڕێزی هاوڕێیەکانت بگریت.



*بە دزیشەوە بێت، ڕقت لە خۆت دەبێتەوە؛ تەنانەت ئەو کاتانەیش، یا ـ بەتایبەت ئەو کاتانەیش ـ کە لە سەروو ئەو نرخەوەی هەتە خۆت دێتە پێش چاو.*

لەو بڕوایەدا نیت کەسێک کە لەسەر مێزێک لەگەڵتدا کۆ بووبێتەوە، یا لە خانوویەکدا لەگەڵت ژیابێت، کاری گەورەی لێ بوەشێتەوە. هەربۆیە هەموو مرۆڤە گەورەکان تەنیا بوون و تەنیا ژیاون. زۆر گرانە بیرکردنەوە لە نزیک تۆوە، پیاوی بچووک! تەنیا هەر ئەوەندە دەکرێت بیر لە تۆ بکرێتەوە، بۆ سوودی تۆ بیر بکرێتەوە، نەک لەگەڵ تۆدا و لە نزیک تۆوە؛ چونکە تۆ بە مەبەستی خنکاندن، دەست لە بینی هەموو بیرە گەورە و مژدەبەخشەکان گیر دەکەیت. ئەگەر دایک بیت، بەو منداڵەت کە بیر دەکاتەوە دەڵێیت: "ئەمە لایەق بە منداڵێک نییە و بۆ تۆ ناشێت!"، ئەگەر پرۆفیسۆر بیت لە زیندەزانیدا بە خوێندکارەکانت دەڵێیت: "ئەمە لەگەڵ خوێندکارێکی ئاساییدا ناگونجێت، یانی چی دوودڵبوون لەوەی لە هەوادا میکرۆب هەیە!" ئەگەر مامۆستا بیت بە قوتابییەکانت دەڵێیت: "منداڵ دەبێت گوێڕایەڵ و بێدەنگ بێت، نەک هەڵەشە و هیچنەبیس!" ئەگەر ژنیش بیت، دەڵێیت: "تۆ و دۆزینەوە! بۆ نارۆییت لەبریی ئەوە بژیوییەک بۆ خۆت و خێزانەکەت بە دەست بهێنیت!"، بەڵام هەر ئەوەندە لە ڕۆژنامەکاندا شتێکت لەبارەی دۆزینەوەکەیەوە بەر چاو بکەوێت، تێی بگەیت یا نا، بڕوای پێ دەکەیت.

هەرچی هەست و نەستێک هەیە دەرهەق بە شتە چاکەکانی نێو خۆت لە دەستت داون و خنکاندووتن. لە هەر کەسێکی تریشدا بیانبینیت، گرنگ نییە منداڵەکانت؛ ژنەکەت؛ پیاوەکەت؛ باوکت یا دایکت بێت، دەیانمرێنیت. بچووکیت و دەیشتەوێت هەروەها بە بچووکی بمێنیتەوە.

لێم دەپرسیت: "ئەم هەموو شتانە چۆن دەزانیت؟"

لێگەڕێ بۆت بگێڕمەوە:

هەمیشە تۆم ناسیوە، ئەزموونەکانتم لەگەڵدا دابەش کردوویت، لەناو خۆمدا بینوومیت، لەگەڵتدا ژیاوم. مینا پزیشکێک لە شتە بچووکەکانی ناوەوەی خۆت قوتارم کردوویت، چون مامۆستایەک

بۆ سەرکەوتن بەسەر هەورازی ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستگۆییدا ڕێپێشاندەرت بووم. دەزانم چەند دڵ پڕ لە کینە هەوڵی خۆپاراستن دەدەیت دژی ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستگۆیی. دەزانم چۆن زراوت لەوە چووە و تۆقیوت کاتێک داوات لێ دەکرێت دوای ژیانێکی بێگرێوگۆل و ڕاست بکەویت.

تۆ بە تەنیا هەر بچووک نیت گرگن!

دەزانم کە خاوەنی چەندان "هەڵکەوتی گەورە"یت لە ژیاندا؛ ئەو هەڵکەوتانەی ڕێی "پێگەیشتن" و "بەرزبوونەوە"ت بۆ خۆشتر دەکەن، بەڵام ئارام نیت و ئەو خۆڕاگرییە لە خۆتدا نابینیت کە پێویستە بۆ بەرزبوونەوەت. ڕێ بە بونیادی خۆت نادەیت بەرز و بەرزترت بکاتەوە! لە فڕین، لە بەرزاییەکان، لە قووڵاییەکان، دەترسیت. لە من گەلێک باشتر و بەر لە من نیتشە ئەمەی پێڕاگەیاندیت، بەڵام پێی ڕانەگەیاندیت بۆ بەو جۆرەی کە هەیت. ئەو هەوڵی دا بتکات بە مرۆڤێکی لە خۆت گەورەتر، بە "سوپەرمان"، تا بتوانیت بەسەر مرۆڤەکەی ناخی خۆتدا زاڵ بیت. مرۆڤە گەورەکەی ئەو بوو بە هیتلەرەکەت و تۆیش لەو جێیەدا کە هەمیشە تێیدا ڕاوەستابوویت، بەبێ جووڵە، مینا مرۆڤێکی لەژێرەوە و گرگنێک، مایتەوە.

دەمەوێت چیی تر مرۆڤێکی لەژێرەوە و بچووک نەبیت. دەمەوێت ببیت بە "خۆت". "خۆت"، نەک ئەو ڕۆژنامانەی ڕۆژانە دەیانخوێنیتەوە. "خۆت"، نەک ئەو تێگەیشتنەی دراوسێ تووڕەوتڕۆکەت هەیەتی بۆت، بەڵکو "خۆت".

دەزانم، لەوە بەئاگا نیت تا چ ڕادەیەک و بە چ قووڵاییەک لە ژێرەوەیت، هەرچەند لە بنی ئەو ژیانەدا مینا ئاهویەک، خوایەک، شاعیرێک و فەیلەسووفێک، دەژیت؛ بەڵام بۆ خۆت و لە پێش چاوی خۆت، پێت وایە ئەندامێکی لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیەی پاراستنی دەوروبەرەکەتی پێسپێردراوە، یا ئەندامێکی لە ئەندامەکانی کو. کلوکس. کلان.. هەر لەبەر ئەوەی پێشت وایە لەوە زیاتر نیت،

چۆن ئەندامێک لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵانە هەڵسوکەت دەکات، تۆیش هەروەها دەکەیت.

ئەمەیشت، زۆر دەمێکە، لە لایەن هاینریش مان لە ئەڵمانیا و ئۆپتۆن سینکلێر و دۆن پاسۆسەوە لە ئەمەریکا پێ ڕاگەیەنراوە، بەڵام تۆ نە هاینریش مان دەناسیت و نە سینکلێر. ئاڵ کاپۆن و پاڵەوانی جیهانی لە کۆڵەمستانێدا چاکتر دەناسیت. ئەگەر ڕێت بدرێت لەنێوان کتێبخانەیەک و چوونە سەیری یارییەکی کۆڵەمستانێدا هەڵبژێریت، بێ دوودڵی، کۆڵەمستانێیەکە هەڵدەبژێریت.

لە ژیانتدا داوای بەختیاری دەکەیت، بەڵام دڵنیایی و خۆپاراستنت گەلێک لە بەختیاری پێ گرنگترە، ئەگەر بەدەستهێنانیان نەک بڕبڕەی پشتت، بەڵکە هەموو ژیانیشت بخوازێت، ئامادەیت لە پێناویاندا دایبنێیت. لەبەر ئەوەی قەت خۆت فێر نەکردووە چۆن بەختیاری بە دەست بهێنیت، تاموچێژی لێوەربگریت و بیپارێزیت، ئازایەتی و بوێریی کەسایەتییەکی ڕاست و لەڕوودارِاوەستاو و پشتئەستووریشت لە باردا نییە.

دەتەوێت بزانیت چۆنیت، پیاوی بچووک؟

گوێ بۆ ئەو بەرنامەی ڕاگەیاندنانە شل دەکەیت کە بۆ فرۆشتنی دەرمانی ددان، بۆیاخی قۆنەرە، دەرمانی قەبزی و بۆنی بنباخەڵ، لە ڕادیـۆوە دەیانبیستیت، بـەڵام قـەت ئـەو ئـاوازە پـڕوپـووچ و بێمانایانە نابیستیت کە لەگەڵیاندا لێ دەدرێن. لەو هێزە کوێرانەیە، لەو توانستە، تێناگەیت کە ئەو کەرەستانە هەیانە و ڕاتدەکێشن و هانت دەدەن بۆ کڕینیان. قەت بە وردی گوێت لەو قەشمەرە گرتووە کە لە یانەیەک لە یانەکانی شەواندا تیزت پێوە دەکات، گاڵتە بە تۆ و بە خۆی و بە دنیا کلۆڵ و بچووکەکەتان دەکات، بۆ ڕابـواردن لە بارەی تۆ و کردارەکانتەوە دەدوێت؟ گوێ بۆ ئەو بەرنامەی ڕاگەیاندنە ڕادێرە کە بۆ فرۆشتنی دەرمانی قەبزی دەکرێت، ئەوسا تێ دەگەیت تۆ کێیت و چۆنیت!

گوێ بگرە، گرگن! هەر گوناهێک، هەر تاوانێکی بچووک، تۆ دەیکەیت؛ ڕووناکییەکی ترە و فڕێ دەدرێتە سەر ئەو کلۆڵییەی مرۆڤایەتی بە دەستیەوە دەتلێتەوە. هەرچییەک دەیکەیت، هیچ و بێمانایە و دەبێت بە مایەی لەدەستدانی ئەو هیوایەت کە بۆ چێتربوونی ژیان و دنیاکەت هەتە. ئەم دڵتەنگی و خەمینییە دڵتەزێن و بێبڕانەوەیە لەخۆڕا و بێ هۆ نییە، پیاوی بچووک! بۆ ئەوەی خۆت لەم دڵتەنگییە دوورەپەرێز بگریت و لە بیری بەریتەوە، چەندان گاڵتە و شۆخیت دۆزیوەتەوە و ناوت لێ ناون: "گاڵتەوگەپی کۆمەڵایەتی!".



*گاڵتە و تیزپێوەکردن لە بارەی خۆتەوە دەبیستیت و لە دڵەوە لەگەڵ خەڵکانی تردا پێدەکەنیت و قاقا لێدەدەیت.*

گاڵتە و تیزپێوەکردن لە بارەی خۆتەوە دەبیستیت و لە دڵەوە لەگەڵ خەڵکانی تردا پێدەکەنیت و قاقا لێدەدەیت. بۆ ئەوە پێناکەنیت، سووکنایییەک بە دڵت بدەیت و کەمێک خەمەکانت بڕەوێنەوە. بە پیاوە گرگنەکە پێدەکەنیت، هاوکاتیش لەوە بێئاگایت بە خۆت پێدەکەنیت، لەوە بێئاگایت پێت پێدەکەنن، خەڵکی پێت پێدەکەنن. ملیۆنان؛ ئەو پیاوە گرگنانەی نازانن کە بوونەتە مایەی گاڵتەپێکردن و

پێکەنین. بۆ پیاو ئاوها لەڕوو، لە دڵەوە، بەو شادمانییە ناجۆر و ناقۆڵایەوە، چەندان سەدەیە، پێدەکەنێت و لە قاقا دەدات؟ قەت بە بیرتدا هاتووە "خەڵک" چۆن بوونەتە مایەی سووکایەتی و گاڵتەجاڕی لەو فیلمانەدا لە بارەیانەوە دەردەکرێن؟

لەبەر ئەوەی شایانی گرنگپێدانێکی تایبەت و بێهاوتای، من بۆت دەگێڕمەوە بۆ ئاوها بوویت بە مایەی گاڵتەپێکردن و پێکەنین.

بێ دوودڵی، بیرکردنەوەت قەت هەقیقەت ناپێکێت و لێی نزیک نابێتەوە. تۆ ئەو نیشانگرە گێژوویژەم بە بیر دەهێنیتەوە کە بە ئەنقەست نیشانەکی ناپێکێت و هێندەی تاڵەدەزوویەک لە پێکانییەوە دوورە.



*بەڵام کاتێک لە ڕۆژنامەکاندا دەیخوێنیتەوە، تێی بگەیت یا نا، بڕوای پێدەکەیت!*

پێت وا نییە!

لێگەڕێ بەڵگەت بۆ بهێنمەوە.

دەمێک بوو بووبوویت بە سەردار و سەروەری ژیانی خۆت، ئەگەر بیرکردنەوەت شانبەشانی هەقیقەت بڕۆیشتایە و لێوەی

نزیک بووایە. با نموونەیەک لە بارەی چۆنێتیی بیرکردنەوەی تۆوە بهێنمەوە.

“هەمووی خەتای جوولەکەکانە!“ تۆ وا دەڵێیت.

“جوولەکە چییە؟“ “خەڵکانێکن خوێنی جوولەکە لە لەشیاندا دەسووڕێت.“ “چ جیاوازییەک لەنێوان خوێنی جوولەکە و ئەو خوێنەدا هەیە کە لە لەشی خەڵکانی تردا دەسووڕێت؟“ ئەم پرسە سەرت لێ دەشێوێنێت و سەرسووڕماو و دوودڵ دەڵێیت: “من مەبەستم لە ڕەگەزی جوولەکەیە.“ لێت دەپرسم: “ڕەگەز چییە؟“ “ڕەگەز؟ ئاسانە، چۆن ڕەگەزی ئەڵمانیایی هەیە، ئاوهایش ڕەگەزی جوولەکە هەیە.“ “چ شتێکە ڕەگەزی جوولەکە لە ڕەگەزەکانی دیکە جیا دەکاتەوە؟“ “جوولەکە سپی نییە، لووتێکی درێژ و ناقۆڵای هەیە، چاوەکانی تیژن، پیسکە و ڕژدە و هەر خەریکی مامەڵەکردنە بە پارەوە.“ “قەت ئیتالیاییەک، یا پیاوێکی خەڵکی خوارووی فەرەنسات لەگەڵ جوولەکەیەکدا بینیوە؟ دەتوانیت لێکیان جیا بکەیتەوە؟“ “نا، لەڕاستیشدا نا...“ ئەی کەواتە جوولەکە چییە؟ خوێن هیچ جیاوازییەک پێشان نادات، جوولەکەیەک هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ فەرەنساییەک یا ئیتالیاییەکدا نییە. قەت جوولەکەیەکی ئەڵمانیاییت بینیوە؟“ “ئەڵمانیاییەکان لە ئەڵمانیایی دەچن؟“ “ئەڵمانیایی چییە؟“ “ئەڵمانیاییەکان دەچنەوە سەر ڕەگەزەکانی باکوور.“ “هەندێکیان لە ڕەگەزی ئاریین؟“ “ئا!“ “ئەی دەچنەوە سەر ڕەگەزی گەلەکانی باکوور؟“ “نەء.“ “سپیپێست و قژزەردەن؟“ “نەء.“ “ئەوە دەیبینیت! نە دەزانیت ئەڵمانیاییەک چییە، نە جوولەکەیەک.“ “بەڵام جوولەکەکان، هەن.“ “بێگومان هەن! چۆن دیانەکان و موسڵمانەکان هەن، جوولەکەکانیش هەن.“ “من مەبەستم لە دینی جوولەکەکانە.“ “ڕۆزفێلت، خەڵکی هۆڵاندا بوو؟“ “نەء.“ “ئەی بۆ کەسێک نەوەی داود بێت بە جوولەکەی ناو دەبەیت، کەچی ڕۆزفێلت بە هۆڵاندایی ناو نابەیت؟“ “جوولەکەکان جیاوازن!“ “چ جیاوازییەک؟“ “نازانم!“

ئەمە قسە هیچوپووچ و بێماناکانتە گرگن! هەر بەم قسە هیچوپووچ و بێمانایانەیشت بوو ئەو هێزە چەکدارانەت خوڵقان کە بوون بە مایەی تەفروتوناکردن و قڕکردنی ملیۆنان مرۆڤ بە ناوی "جوولەکە"وە، هەرچەندە کە نایشتوانیت بڵێیت جوولەکە چییە.



*لە فڕین، لە بەرزاییەکان و قووڵاییەکان دەترسیت.*

لەبەر ئەمەیە پێت پێدەکەنن و سووکایەتیت پێدەکرێت. لەبەر ئەمەیە، مرۆڤێک کە بە کارێکی گرنگەوە خەریکە، خۆیت تێناگەیەنێت، خۆیت لێ لا دەدات و خۆ دوورەپەرێز دەگرێت لێت. لەبەر ئەمەیە، لەو چلپاوەی تێی کەوتوویت، قوتارت نابێت. خۆت باڵادەستتر دێتە پێش چاو، کاتێک کەسێکی تر بە "جوولەکە" ناو دەبەیت، هاوکاتیش هەست دەکەیت کە کلۆڵیت، چونکە تۆ بە کوشتن و لەناوبردنی ئەو مرۆڤانەی بە "جوولەکە" ناویان دەبەیت، خۆت دەکوژیت و خۆت لە ناو دەبەیت. ئەمەیش، بەشێکی زۆر بچووک، پچەکە، لەو ڕاستییەی لە بارەی تۆوە هەیە، پیاوی بچووک!

کاتێک بە ڕقەوە کەسێک بە "جوولەکە" ناو دەبەیت، بستەبالایی و هیچلەبارانەبوویی خۆت خەفە دەکەیت و لە بیری دەبەیتەوە.

دەمێک نییە ئەمەم بۆ ئاشکرا بووە.

هەر کەسێک، کەمتر یا زیاتر لەوەی لایەقتە، ڕێزت لێ بگرێت، بە "جوولەکە" ناوی دەبەیت. وەک ئەوەی دەستەڵاتێکی باڵا بیت و لە ئاسمانەوە ڕەوانە کرابیت، بڕیار دەدەیت کێ بە "جوولەکە" بزانیت یا نا، بەڵام من ئەو مافەت پێ ڕەوا نابینم، ئاریی گرگن! جوولەکەی گرگن! تەنیا خۆمم و کەسی دیکە نییە لە سەرانسەری دنیادا بتوانێت بڕیار لەسەر ئەوە بدات من کێم. چ لە باری فەرهەنگییەوە، چ لە باری پێکهاتەی لەشمەوە، تێکەڵم لە تەواوی ڕەگەزەکان و شانازیش بەوەوە دەکەم کە دەرئەنجامی هەموو ڕەگەزەکان، هەموو چینەکان و تەواوی نەتەوەکانم. وەک تۆ نیم پیاوە گرگنە شۆڤێنیستە فاشیستەکەی ناو هەموو ڕەگەز و چینەکان. نە خۆم وا دەبینم لە ڕەگەزێکی پاک بم، نە لە باری کۆمەڵایەتییەوە بێ هەڵەوپەڵە بم. بیستم، لە فەلەستین، جوولەکەیەکی کارامە و شارەزات نەخواست، چونکە خەتەنە نەکرابوو. چۆن ڕقم لە هەر فاشیستێکی تر دەبێتەوە، ئاوهایش حەز لە چارەی هیچ "جوولەکە"یەکی فاشیست ناکەم و ڕقم لێی دەبێتەوە.

هیچ هەست و نەستێکم بەرانبەر زمانی جوولەکەکان، دینەکەیان یا فەرهەنگەکەیان نییە. چیی تر نە باوەڕم بە خوای جوولەکەکان، نە خوای دیانەکان، نە هی هیندییەکان نییە، بەڵام دەزانم تۆ لە کوێوە خواکەی خۆت بە دەست دەهێنیت. باوەڕم بەوە نییە جوولەکەکان "تەنیا نێردراوی خوا" یا "نەتەوە هەڵبژێردراوەکە" بن. باوەڕم بەوە هەیە ڕۆژێک دێت جوولەکەکانیش لەنێو مرۆڤانی زیندووی بڵاوەبوو بە هەموو کون و قوژبنێکی ئەم سەرزەمینەدا دەتوێنەوە و توانەوەیشیان هەم بە چاکە بۆ خۆیان و هەم بۆ نەوەکانی داهاتوویان دەگەڕێتەوە. پیاوە گرگنە جوولەکەکە! دەزانم پێت خۆش نییە ئەمە ببیستیت. لە بارەی "بوونت وەک

جوولەکەیەک“ەوە دەپەیڤیت، چونکە ڕقت لەوە دەبێتەوە کە جوولەکەیت، ڕقت لە هەموو ئەو کەسانەیش دەبیتەوە لێتەوە نزیکن. جوولەکە بۆ خۆی خراپترینی ئەو کەسانەن کە ڕقیان لە جوولەکە دەبێتەوە. ئەمە ڕاستییەکی کۆنە، نەک تازە؛ بەڵام من نە ڕقم لێتە و نە ڕقیشم لێت دەبێتەوە. تەنیا ئەوەیە کە هیچ شتێک لەگەڵ تۆدا کۆم ناکاتەوە و هیچ شتێکی هاوبەشمان پێکەوە نییە، “چینییەک چەندێ لەگەڵ ورچێکدا“ شتی هاوبەشی هەیە، من و تۆیش ئاوها؛ تەنیا ئەوە نەبیت کە هەردووکمان دەگەڕێینەوە سەر هەمان بنەڕەت و بنەچەی ماددی کە لە گەردووندا هەیە. بۆ دەستبەرداری “شێم“ نابیت و ناگەڕێیتەوە بۆ “پرۆتۆپلازما“، جوولەکەی گرگن! ژیان، بۆ من، لە چوونەوەیەک و گرژبوون و دووبارە کشانەوەی “پلازما“وە دەست پێدەکات، نەک لەو وتارە ئایینییانەوە کە “ڕابین“ێک دەیاندات و دەیانڵێت و دەیانجوێتەوە.

ملیۆنان ساڵی خایاند، تا تۆ لە بوونەوەرێکی دەریاییەوە بوویت بەو گیانەوەرە ڕەپڕاوەستاوەی سەر وشکایی. بە درێژایی شەش هەزار ساڵ لە بارێکدا کە تا ئێستایش سەرتاپای گرتوویتەتەوە و ڕێت پێ نادات لەگەڵ خودی خۆت و دەوروبەرەکەتدا بگونجێیت و ڕابێیت، ژیاویت. دەمێکی دوورودرێژ و نادیاریش دەخایێنێت، تا سروشتی ئاساییی خۆت، تا ئەو بوونەوەرە دەریاییەی نێو خۆت دەدۆزیتەوە. من، ئەو بوونەوەرە دەریاییەی نێو لەشی تۆم دۆزیوەتەوە و بێ گرێوگۆل و بە ئاشکرا لە بارەیەوە بۆت دواوم. کاتێکیش کە لە بارەی ئەو دۆزینەوەیەوە بیستت، بە هەموو لایەکدا جاڕت دا کە بلیمەتێکی نوێت دۆزیوەتەوە. ئەگەر لە بیرت نەکردبێت، ئەمە لە سکەندناڤیا ڕووی دا؛ لە کاتێکدا بوو کە بە دوای دۆزینەوەی لێنینێکی نوێدا وێڵ بوویت. منیش، لەبەر ئەوەی کاری لەوە گرنگترم هەبوو خۆم بە پێناساندن و جاڕدانی تۆوە خەریک بکەم، هیچ گرنگییەکم بەو کارەت نەدا و پێداهەڵدان و بەرەوڕووهاتنی تۆم نەگرتە خۆ و بێجگە لەوەیش ڕاتگەیاند و جاڕت دا کە لە مندا داروینێکی نوێ، مارکسێک، پاستۆر یا

فرۆیدێکی نوێت بە دەست هێناوە. منیش پێم ڕاگەیاندیت کە تۆیش لە بارتدا هەیە و دەتوانیت، ئەگەر دەست لە هاتوهاوار و پەسندانی خەڵکانی دی هەڵبگریت، بە هەمان شێوەی من بنووسیت و بپەیڤیت. خۆت خودی هەڵبژاردنەکەی خۆت بوویت و هاتوهاوار و پەسندانی خەڵکانی ترت هەڵبژارد!

هاتوهاوار و قیژەقیژت هەستەکانت دەمرێنن، سروشتە خوڵقێنەرکەت ئیفلیج دەکەن و لە پەلوپۆی دەخەن.



*ملیۆنان ساڵی خایاند، تا تۆ لە بوونەوەرێکی دەریاییەوە بوویت بەو گیانەوەرە ڕەپڕاوەستاوەی سەر وشکایی.*




داوای بەختەوەری دەکەیت، بەڵام دڵنیاییت گەلێک لا گرنگترە.

خۆ ئەوەیش بۆهەڵبەستن نییە کە لە هەر شوێنێک بەو "دایکانەی کە بێ پێکهێنانی خێزان و لە دەرەوەی خێزاندا بوون بە دایک" بگەیت، بە بێڕەوشت ناودێریان دەکەیت! خۆ ئەوە بۆ هەڵبەستن نییە کە تۆ سنوورێکی دیار و لەبەرچاوت لەنێوان منداڵانی "زۆڵ" و منداڵانی "ڕاستەقینە!"دا کێشاوە!؟ چ لێقەوماوێکی بچووکی کە ون و سەراسیمە و سەرلێشێواو بە هەموو لایەکدا ڕادەکەیت و سکاڵا و گازندە دەکەیت، پیاوی بچووک!

تۆ تەنانەت لە ناوەڕۆکی پەیڤەکانی خۆیشت تێناگەیت.

بە ڕێزەوە لە عیسای مەسیحی منداڵ دەڕوانیت، بەڵام مەسیح لە دایکێک بوو کە هیچ پسوولەیەکی مارەبڕینی لە دەستدا نەبوو. بێ ئەوەی بەئاگا بیت و تێبگەیت، بە تەنیا تاسە و ئارەزووت بۆ "سەربەستبوونی جنسی"یە وات لێ دەکات بە ڕێزەوە لە مەسیح بڕوانیت و ڕێزی لێ بگریت و هیچی تر. تۆ؛ پیاوە لێقەوماوە ڕاستەقینە گرگنەکە! مەسیح دەکەیت بە کوڕی خوا؛ خوایەک کە پێی وا نییە هیچ منداڵێک لە دەرەوەی پێوەندیی خێزانیدا لە دایک ببێت، دواییش بەدکار و گرگن، مینا پاوڵۆسێکی ڕچەشکێن، دەکەویتە ڕاوەدونانی منداڵانی لەدایکبووی نێو ئامێزی خۆشەویستیی ڕاستەقینە و منداڵانی نێو دەستی ڕقیش، بە یاسا ئایینییە دەستکردەکانی خۆت، دەپارێزیت.

تۆ پیاوێکی بەڕاستی نەگریس و بچووکی!

بەسەر ئەو پردانەدا کە گالیلەیۆی مەزن نەخشەی دروستکردنی کێشاون داژۆیت. ئەی ئەو پیاوە بچکۆلەیەی سەرانسەری دنیات گرتۆتەوە، دەزانیت کە گالیلەیۆ بێ ئەوەی پسوولەی مارەبڕینی هیچ ژنێکی لە دەستدا بووبێت، سێ منداڵی هەبوو؟ دڵنیام قەت ئەمە بۆ خوێندکارەکانت ناگێڕیتەوە. هەر لەبەر ئەوەیش نەبوو کە کەوتیتە وێزە و گیانی ئەو و بوویت بە مایەی شاربەدەرکردن و وڵاتبەدەرکردنی؟

دەزانیت پیاوی بچووک! کە لە وڵاتی کۆیلەکاندا لێنینی مەزن؛ باوکی کرێکارانی دنیا ـ یا باوکی گشت کۆیلەکان! ـ کاتێک دەستەڵاتی بە دەست هێنا، کۆتایی بەو شێوازە هێنا کە بۆ پێکهێنانی خێزان داتڕشتبوو؟ ئەی ئەوە دەزانیت کە ئەو خۆیشی، بەبێ ئەوەی هیچ پسوولەیەکی مارەبڕینی لە دەستدا هەبووبێت، لەگەڵ ژنەکەیدا دەژیا!؟ ئەوەت دەزانی، بەڵام کردبووت بە نهێنییەک و نەتدەویست لە بارەیەوە بدوێیت، گرگن!

وا نییە!؟ ئەی تۆ نەبوویت کە لەڕێی شوراکانی کرێکارانەوە سەرپاکی یاسا کۆنەکانت دەربارەی خێزان و چۆنێتیی پێکهێنانی گەڕانەوە، چونکە لە تواناتدا نەبوو ئەو کارە مەزنەی لێنین بپارێزیت و بۆ چێترکردنی ژیانت بە کاری بهێنیت؟

بەهەمەحاڵ، تۆ کێیت تا دید و تێڕوانینی تایبەت بە خۆتت هەبێت؟

تەواو لەوە بێئاگایت کە خودی ئەندێشە پیس و گەمارەکانی خۆتن، گرنگینەدانتە بە حەز و ئارەزووەکانی لەشی خۆت، بەو یاسانەوە لوولی داویت و بەندی کردویت کە لە بارەی خێزان و پێکهاتنیەوە داتناون.

من وتم: هەست دەکەیت کلۆڵ و گرگن و چەپەڵ و بۆگەن و لە بارێکی دەروونیی نائاساییدایت، ئیفلیج و لەپەلوپۆکەوتویت. هەست دەکەیت کە ناتوانیت تاموچێژ لە لەشی خۆت وەربگریت. هەست دەکەیت بێنرخ و نازیندوو و پووت و ڕەقوتەقهەڵاتویت. دۆستێکی کچت نییە، هەیشتبێت تەنیا بۆ ئەوەتە "بینێیتە ژێر خۆت" تا بەو کارەت "پیاو"ەکەی ناخت بسەلمێنیت. نازانیت خۆشەویستی و ئەوین چییە. قەبزیت و قەبزیەکەیشت بە دەرمان چارەسەر دەکەیت. بۆنت ناخۆشە و پێستەکەت لینج و ساردوسڕە. هەست بە منداڵەکەت ناکەیت لە باوەشتدا، بۆیە دەتەوێت ئەویش بکەیت بە سەگێکی بچکۆلەی ژێر شەق و قامچییەکان.

تـەواوی ژیانت زەندەقت لـەوە چووە توانای "ڕەحەتبوون" لە دەسـت بدەیت. ئەمە گشت بیرکردنەوەکانی داگیرکردویت و خۆی ئاخنیوەتە نێو کارەکەتەوە. ژنەکەت بە جێی هێشتویت و تەنیا ماویتەتەوە، چونکە نەتتوانیوە خۆشەویستی بدەیتێ. بە دەست پەشیمانی و زمانی خۆ گەستن و پەشۆکان و دڵەڕاوکێوە دەناڵێنیت و هەموو بیرکردنەوەکانت لە دەوری ناوگەڵت و لە دەوری تاموچێژ و حەزەکانت دەسووڕێنەوە.

کەسێک لە بارەی تێگەکانی منەوە دەربـارەی سێکس لەگەڵتدا دەپەیڤێت و پێت ڕادەگەیێنێت کە ئەو تێگانە لیت تێدەگەن و دەتوانن یارمەتیت بدەن، کە ئەو تێگانە دەیانەوێت ئەوەت بۆ بڕەخسێنن کە "شەوانە" بتوانیت لەگەڵ خەون و حەز و ئارەزووەکانی نێو لەشتدا بژیت، بۆ ئەوەی "ڕۆژانە"، ئازاد و سەربەست لەو خەون و حەز و ئارەزووانە، بتوانیت بە کارەکەتەوە خەریک بیت و بە سەرکەوتویی بە جێی بگەیێنیت، کە ئەو تێگانە دەیانەوێت ژنەکەت لە ئامێزتدا شاد و بەختیار بێت، نەک سەراسیمە و پەشۆکاو، کە ئەو تێگانە دەیانەوێت مندالەکانت ڕووگەش و گەشاوە بن، نەک کز و لاواز و ڕەنگزەرد، خۆشەویست بن، نەک بەدکار و دەغەزار. تۆ دەڵێیت: "تاموچێژەکانی لەش هەموو شتێک نین لە ژیاندا و شتی گرنگتر هەن پیاو پێیانەوە خەریک بێت!"

تۆ ئاوهایت، تەپەسەر، پیاوی بچووک!

گریمان مارکسییەک، شۆڕشگێڕ، ڕابەرێکی ئاییندەیی کرێکارانی دنیایت، یا باوکێکی ئاییندەیی شورا کرێکارییەکانی ولاتێکیت لە ولاتان و دەتەوێت دنیا لەو ئازارەی بە دەستیەوە دەناڵێنێت ڕزگار بکەیت. ئەو خەڵکە بێشومارەیش کە لە ژماردن نایەن لە دەستت هەڵدێن و لێت دوور دەکـەونـەوە، تۆیش بە هاتوهاوار دوایان دەکـەویت: "بوەستن! ئێوە ئەی خەڵکانی کۆیلە و بەشخوراو، بوەستن! نابینن من ڕزگاری ئێوەم! ئێستایش هەر ناخوازن دان بەو ڕاستییەدا بنێن!؟ بڕوخێت سەرمایەداری!"

منم، ئەو خەڵکە بێشومارەم خستۆتە بزاوتن و جووڵە و نەگبەتییەکانی ژیانە پڕ لە کڵۆڵییەکەیانم پێشان دوان، نەک تۆ؛ شۆڕشگێڕی گرگن! ئەوان، دڵ پڕ لە هیوا، بە تاسە و شەوقەوە، گوێ بۆ پەیڤەکانی من ڕادەدێرن. ڕوو دەکەنە ڕێکخراوە و دامەزراوەکانی تۆ، چونکە پێیان وایە لەوێ من دەبیننەوە. تۆیش، لە بارێکی وەهادا، هەر ئەوەندەت لە دەست دێت، بڵێیت: "تاموچێژەکانی لەش بەهەڵەداچوون و سەرلێشێوانێکی بۆرژوا بچووکەکانە و لە بنەڕەتدا بە هۆکارە ئابوورییەکانی نێو کۆمەڵەوە بەندە!" هاوکاتیش، کتێبەکەی ڤان دۆ ڤەلدەس لە بارەی شێوەکانی گانکردنەوە دەخوێنیتەوە.



*بە درێژاییی شەش هەزار ساڵ، بەو بارە ناهەموار و ڕەقوتەقەوە کە هەتا ئێستایش سەراپای گرتویەتەوە، ژیاویت.*

کاتێک پیاوێکی گەورە هەوڵی دا بنەمایەکی زانستی بە ئازادبوونت ببەخشێت، بە دەستی نابووتی و هەژاریت سپارد. یەکەم هەوڵ کە بۆ پەردەلەڕووهەڵماڵینی ڕاستییەکان درا بە تێنەگەیشتن و بە هەڵە تێگەیشتنت لە یاساکانی ژیان، کوشتت. کاتێکیش هەوڵ و تەقەلاکانی ئەو جێی خۆیان کردەوە و کاریان پێ کرا، هاتیت و دەستت بەسەر بەڕێوەبردنیاندا گرت و بەو کارەیش دووبارە بە چنگی مەرگت سپاردنەوە. یەکەم جار ئەو پیاوە گەورەیە ڕێکخراوەکەتی هەڵوەشاندەوە و دووەم جاریش، خۆی لە ژیاندا نەمابوو، بۆیە چیی تر نەیتوانی بەرەنگاریت بکات و دژت بوەستێت. لەوە تێناگەیت کە ئەو لە کارەکەی تۆدا بەهای خوڵقێنەرانەی هێزی ژیانی تۆی دۆزیبووەوە. لەوە تێناگەیت کە تێگەکانی ئەو لە بارەی زانستی کۆمەڵناسییەوە بۆ ئەوە بوو پارێزگاری لە "کۆمەڵ"ەکەت بکات، دژی "دەوڵەت"ەکەت.

لەڕاستیدا تۆ لە هیچ شتێک تێناگەیت، گرگن!

بە "هۆکارە ئابوورییەکانتەوە" ناگەیت بە هیچ جێیەک و بە هیچ ناگەیت. زانایەکی گەورە تا سەرەمەرگ بەوەوە خەریک بوو فێرت بکات بۆ ئەوەی بتوانیت تاموچێژ لە ژیانت ببینیت، دەبیت هەوڵ بدەیت زانستەکان چاکتر و لەبارتر بکەیت، بەوەوە خەریک بوو فێرت بکات کە مرۆڤانی برسی ناتوانن شارستانیەت بەرەوپێش ببەن و بیگەیەننە پلەیەکی بالاتر کە هەموو مرۆڤان، بەبێ هیچ جیاوازییەک، دەبێت لە گەیاندنی شارستانییەتدا بۆ ئاستێکی بالاتر و لە بەرەوپێشبردنیدا خەریک بن، کە دەبێت هەم خۆت و هەم کۆمەڵەکەت لە دەست هەر جۆرە دەستەڵاتێکی داپڵۆسەر و زاڵ قوتار بکەیت. ئەو پیاوە گەورەیە، کاتێک زانیارییەکانی خۆی پێ دەگەیاندیت، تەنیا هەڵەیەکی بچووکی کرد: باوەڕی پێت هەبوو کە بتوانیت خۆت ئازاد بکەیت، چونکە دڵنیا بوو لەوەی لە تواناتدا هەیە ئازادییەک کە بە دەستت هێناوە بیپارێزیت و بۆ هیچ نرخێک لە دەستی نەدەیت. بێجگە لەوەیش، ڕێی پێدایت تۆی "کرێکار" ببیت بە "دیکتاتۆر!".

تۆ چیت لەگەڵ بیرە بەتاو و دەوڵەمەندەکانی ئەو زانایەدا کرد، گرگن! ئەو چەندان بیری بەرفراوان و بەسوودی پێدایت، بەڵام تۆ تەنیا پەیڤێکت لێ وەرگرت: "دیکتاتۆریەت". لە هەموو ئەو شتانەی لە دڵێکی گەرم و گەورە کەوتبوونەوە، تەنیا پەیڤێکت وەرگرت و فێری بوویت: "دیکتاتۆریەت".



*ژەنەراڵە کرێکارەکە!*

هەرچییەکی تر هەبوو، تووڕت دا و وەلات نا: سەربەستبوون، ڕێزگرتن لە ڕاستی، چارەسەرکردنی کۆیلەیەتیی ئابووری، شێوازەکانی بیرکردنەوەی خولقێنەرانە و تەنیا پەیڤێکی پڕ مانا، بەڵام خراپ هەڵبژێردراوت هێشتەوە: "دیکاتۆریەت".

لەم هەڵە بچووکەی ئەو زانایە، دنیایەکی زەبەلاح و ئاوەڵات لە درۆ، ڕاونان و وەدوکەوتن، ئازار، زیندان، جەللادان، پۆلیسی نهێنی، سیخوڕی و لەسەر یەک جاڕدان، جلکی ڕەسمی و ژەنەڕاڵ و مەدالیاکان پێکهێنا و هەرچییەکی تر مایەوە تووڕت دا.

ئێستا کەمێک چاکتر تێدەگەیت کە چۆنیت، پیاوی بچووک؟

هێشتا هەر تێناگەیت؟

کەواتە با دەست پێ بکەینەوە:

هەموو ئەو "هۆکارە ئابوورییانەی" بۆ ژیانت و بۆ بەختیاریت لە خۆشەویستیدا لە دەستدا بوو، گۆڕیتەوە بە بیرۆکەیەکی ناجۆر و نامۆ بە ژیانت. "سەربەستیی مرۆڤایەتیت، بە باڵادەستی و مەزنیی دەوڵەت گۆڕییەوە."، "ئامادەبوون بە قوربانیدان بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامی مەزنت، گۆڕییەوە بە بیرۆکەیەکی بێمانا و بێهۆ: زەبتوڕەبی حزبی"، "بەئاگاهاتن و هۆشیاربوونەوەی ملیۆنان خەڵکت، گۆڕییەوە بە ڕاوەستان و چەپڵەلێدان بۆ ئەو نمایشانەی کە توانستە سوپاییەکانی خۆتت تێیاندا پیشان دەدان"، "ئەوینی ئازادت، بە دەستدرێژیکردنە سەر ئابرووی ژنان گۆڕییەوە ـ کاتێک گەیشتیتە ئەڵمانیا و سەرکەوتنت بە دەست هێنا"، "ڕەتکردنەوەی دەستگیرۆییی بێدەرەتانان و لێقەوماوانت، گۆڕییەوە بە قڕکردن و تەفروتوناکردنی هەژاران"، "ڕێنمایی و پەروەردەکردنی منداڵانت، گۆڕییەوە بە پەروەردەکردن و گۆشکردن لەڕێی نیشتماندا"، "چێکردن و نەخشەکێشانی ئابووریی نێوماڵت، گۆڕییەوە بەو مەدالییانەی دەتبەخشین بەو دایکانەی دە منداڵیان لێ دەبوو"، بۆ خۆیشت بە دەست ئەو بیرەتەوە ئازارت نەچێشتووە: دایکێک و دە منداڵ!؟

ئەم پەیڤە بەدبەختە "دیکتاتۆریەت" لە وڵاتی تریشدا لە گوێیەکانتدا دەزرِنگایەوە، لە شوێنەکانی تریشدا تۆ بوویت جلکی ئاڵووالآی ڕەسمیت لە بەر کرد و ئەو مرۆڤە قەت ڕەحەتنەبووە، سەیر و سەمەرە و سادییەی کە نەوەی فەرمانبەرێک بوو خوڵقاند، کە لە ئەنجامدا گەیاندیتیە "ڕایخی سێیەم" و شەست ملیۆن مرۆڤی وەک خۆتی لەو پێناوەدا بە گۆڕ سپارد، کەچی هێشتا هەر لە هاتوهاوار و پێداهەڵدان و لە چەپڵەلێدانی خۆت نەکەوتویت و بەردەوامیت!



*ژیان دەخۆیت، ژیان هەڵدەلووشیت!*

تۆ ئاوهایت پیاو بچووک!، بەڵام کەس ناوێرێت بۆت بگێڕێتەوە چۆنیت، چونکە پیاو لێت دەترسێت و دەخوازێت هەروەها بە پووتی و بچووکی بمێنیتەوە.

تۆ بەختیاریی خۆت هەڵدەلووشیت.

قەت بە ئازادییەکی تەواوەوە تاموچێژت لە بەختیاری نەکردووە، گرگن! هەربۆیەیش چڵیسانە هەڵیدەلووشیت، بەبێ ئەوەی گوێ بە پاراستن و گرنگی بە مانەوەی بدەیت. قەت فێر نەبوویت چۆن باخەوانێک گوڵەکانی و کشتیارێک بەروبوومی کێڵگەکەی چاودێری دەکات و دەیپارێزێت، تاسە و ئارەزووەکانت بپارێزیت و بە تەنگ بەختیاریتەوە بێیت. تۆێژەرەوە گەورەکان، شاعیران و زاناکان، لە دەستت هەڵهاتن و لێت دوور کەوتنەوە، چونکە دەیانویست بەختیاریی خۆیان بە دەست بهێنن. لەگەڵ تۆدا هەڵلووشینی بەختیاری ئاسانە و پاراستن و بەتەنگەوەهاتنی گران، پیاوی بچووک!

تێناگەیت لە بارەی چییەوە دەدوێم، گرگن! وا نییە؟

هەوڵ دەدەم بۆت بگێڕمەوە:

داهێنەرێک بە دۆزینەوەی دیوە نادیار و نائاشکراکانی زانستێک، یا ئامێرێک، یا دۆزێکی کۆمەڵایەتییەوە بێوچان و دەمێکی دوورودرێژ و بەوپەڕی توانایەوە لە کارکردندا خەریک دەبێت. ئەو داهێنەرە دەبێت بە تەنیا باری گرانی ئەو کارەی پێوەی خەریکە هەڵبگرێت، دەبێت بەسەر گشت دەبەنگی و بیرۆکە ناجۆر و نابەجێیەکانتدا، بەسەر هەرچییەکدا تۆ پێت گرنگە، تێپەڕێت و تێیان بگات، لێیان بکۆڵێتەوە و شییان بکاتەوە؛ دەرئەنجامیش بە ئەنجامدانی کارێکی بەسوود لەبرییان دواییان پێ بهێنێت. لە کارەکەیدا نەک دەستی یارمەتی بۆ درێژ ناکەیت، بەڵکو بە هیچ کلۆجێک خۆتی تێ ناگەیەنیت. بەرەو پیری ناچیت و ناڵێیت: "هاوڕێم، دەتبینم چەند شێلگیرانە کار دەکەیت، ئەوەیش دەبینم کە بۆ چێترکردنی

ئامێرەکەم، منداڵەکەم، ژنەکەم، هاوڕێیەکەم، خانووبەرە و ماڵەکەم، کێڵگەکەم کار دەکەیت، دەمێکە من بە دەست گیروگرفتەوە دەناڵێنم، بەڵام نەمتوانیوە خۆم یارمەتیی خۆم بدەم، دەتوانم هالیکاریت بکەم بۆ ئەوەی لەو ڕێیەوە یارمەتیی خۆم بدەم؟"

نا! قەت بە پیری کەسێکەوە ناچیت تا هالیکاری بکەیت و دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەیت، پیاوی پووت!

تۆ، یا خەریکی هاتوهاوار و چەپڵەلێدان و پێداهەڵگوتنی، یا خەریکی یاریی کاغەزیت، یا لە دەوروخولی شەڕ و بەیەکدادانێک خەریکی قیژەقیژ و هەرای خۆتیت، یا لە کانەخەڵووزێکدا وەک کۆیلەیەک دەڕەتێیت. هەر کارێکی تری لەو چەشنە دەتوانیت بکەیت، بەڵام قەت ڕێ بە خۆت نادەیت دەستی یارمەتی بۆ ئەو داهێنەرە درێژ بکەیت و هالیکاریی بکەیت لە کارەکەیدا، کە دەخوازێت هالیکاریت بکات و دەستی یارمەتیت بۆ درێژ بکات.

دەزانی بۆ؟ چونکە ئەو داهێنەرە لە سەرەتا و دەستپێکی دۆزینەوەیەکی نوێدا، بێجگە لە هەندێ بیر، چیی تری لە دەستدا نییە پێشکەشتی بکات؛ نە مژدەی دەستکەوتێکی زۆر بە ڕێیەکی کورت و نە مژدەی شێوازێکی ئاسانتری پێیە بۆ ژیان. تەنیا کۆمەڵێک گرفت و کێشەی نوێ لە هەگبەکەیدان و تۆیش هێندە گیروگرفت و خەمینیت هەیە لە خۆت زیاد، لەبەر ئەوە هیچ بە دەنگ گیروگرفت و کێشەکانی ئەوەوە نایەیت.

ئەمیان گرنگ نییە و گرنگ ئەوەیە، لە بەردەمیدا نەبیت بە ئاستەنگ و بەری ڕێیەکەی بۆ بەرەڵا بکەیت و لێی بگەڕێیت، ئەوا ئەو داهێنەرە نە لەبەر خاتری تۆ و نە بۆ تۆ هەست بە ناشادی و دڵتەنگی ناکات. ئەو نە بۆ تۆ کار دەکات، نە لەبەر خاتری تۆ بیر دەکاتەوە و شپرزە دەبێت و دادەهێنێت. هەرچییەک دەیکات لەبەر ئەوەیە کە جۆری ژیانی خۆی پاڵی پێوە دەنێت وا بکات. گوێپێدان و گرنگیدان و بەزەییهاتنەوەیش بە تۆدا بۆ ڕابەرانی

پارتییەکانت، بۆ قەشە و پیاوانی تری ئایینی بە جێ دەهێڵێت. لەو بڕوایەدایە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە و وەختە کە خۆت چاودێریی خۆت بکەیت و بە تەنگ خۆتەوە بێیت. تۆ، هەر بەوە ڕازی نیت دەستی یارمەتی لێ بکێشیتەوە، بەڵکو دەبیت بە لەمپەر لە ڕێیدا و تفی تێدەکەیت. کاتێکیش ئەو داهێنەرە، دوای کارێکی سەخت و دەمێکی دوورودرێژ خەریکبوون بە کارەکەیەوە، تێدەگات بۆ ناتوانیت ژنەکەت بە خۆشەویستی شاد و خەنی بکەیت، دێیت و دەڵێیت کە "ئەو" بەرازێکە و سەراپای لە زەلکاوی جنسدا نقووم بووە. قەت ئەوەت بە بیردا نایەت، لەبەر ئەوە وا دەڵێیت، چونکە خۆت ئەو بەرازەی کە پەلوپای لە زەلکاوی جنسدا نقووم بووە، هەر لەبەر ئەوەیشە کە ناتوانیت و لە بارتدا نییە خۆشەویستی بکەیت. یا کاتێک ئەو داهێنەرە، دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە بۆچ خەڵکی بە چەشنی مێش و بەکۆمەڵ بە نەخۆشیی شێرپەنجە دەمرن، ئەگەر ڕێکەوت پرۆفیسۆرێک بیت لە "باتالۆژی"دا و پلەوپایە و بژێوییەکی چاکت لەو ڕێیەوە بە دەست هێنابێت، ڕادەگەیەنیت کە ئەو داهێنەرە فریودەرێکە و هیچی تر، یا دەڵێیت کە هیچ زانیارییەکی لە بارەی بەکتریاکانی ناو هەواوە نییە، یا دەڵێیت کە پارەیەکی لە پێویست زیاتری خراوەتە بەر دەست بۆ توێژینەوە، یا دەپرسیت ئاخۆ جوولەکەیە، هاوزێدە یا خەڵکی وڵاتێکی دیکەیە، یا پێ لەسەر ئەوە دادەگریت کە دەبێت ئەو داهێنەرە تاقی بکەیتەوە تا دڵنیا بیت لەوەی ئاخۆ لە توانایدا هەیە بە گیروگرفت و کێشەی شێرپەنجەکەتەوە خەریک بێت؛ ئەو گیروگرفت و کێشانەی بە خۆت تێیان ناگەیت و ناتوانیت چارەیان بۆ بدۆزیتەوە، یا هەر هیچت پێ نەکرێت ئەوەت پێ باشترە ببینیت خەڵکانێکی زۆر بە بەر چاوانتەوە نەخۆشیی شێرپەنجە بیانکوژێت، لەبریی ئەوەی دان بـەوەدا بنێیت و بـڕوا بە خۆت بهێنیت کە "ئـەو داهێنەرە" ئەو شتـەی دۆزیـوەتـەوە کە لە ناخەوە پێویستت پێی هەیە تا بتوانیت نەخۆشەکانت لەو دەردە کوشندەیە قوتار بکەیت. بۆ تۆ ئەو پلەوپایەی هەتە، ئەو مافانەی مینا زانایەک پێت بەخشراون، دەفتەرەکانی پارەپاشەکەوتکردنت، پێوەندیت لەگەڵ ئەو دامەزراوە

و کەسانەدا کە بوون بە مایەی زیاتر زەنگینبوونت، لە توانستی زانستی و ڕاستییەکان گرنگترە. هەر لەبەر ئەوەیشە ئاوها بچووک، دەغەزار و گرگن و هیچلەباردانەبوویت، پیاوی بچووک!

تۆ هەر بەوە ناوەستیت و لێناگەڕێیت کە دەستی یارمەتی بکێشیتەوە، بەڵکو دەبیت بە ئاستەنگێک و بێبەزەیی و دڵڕەقانە بەری ڕێ لە کاری ئەو داهێنەرە دەگریت کە بۆ تۆ و لەبریی تۆ بە داهێنانەکانیەوە خەریکە. ئێستا تێدەگەیت بۆ بەختیاری لێت هەڵدێت و خۆی لە چنگت دەرباز دەکات؟ چونکە بەختیاری دەخوازێت شتێک بێت بە هەوڵ و ماندووبوون بە دەست بهێنرێت و بە دڵ خزمەت بکرێت و بپارێزرێت، بەڵام تۆ تەنیا هەڵلووشینی بەختیاریت دەوێت و ئەویش لەبەر ئەوەی نایەوێت هەڵیلووشی لێت هەڵدێت.



*بلیمەتێکی سنووربۆکێشراو، باڵکراو، شیک و پاکژت دەوێت، تا بتوانیت بەبێ ئەوەی شەرم داتبگرێت شانبەشانی خۆت بە شەقامەکانی شارەکانتدا بیگەڕێنیت!*

ئەو داهێنەرە، لە ماوەی خەریکبوونیدا بە کارەکەیەوە، زۆر لە خەڵکانی بەوە قایل کردووە کە دۆزەکانی جێی بڕوان و دەکرێت لە بواری بەجێهێناندا بێ بەر نەبن. با بڵێین: ئەو دۆزانە بۆ تێگەیشتن لە نەخۆشییە دەروونییەکانی تۆ، یا بۆ تەقاندنەوەی گاشەبەردێک، یا بۆ دۆزینەوەی ڕێیەکانی چارەسەرکردنی وەرەمەکانت، یا بۆ تێڕوانین لە ئەندامەکانی لەشت بەهۆی بەکارهێنانی ڕووناکییەوە، گرنگن؛ بەڵام تۆ تەنیا ئەو کاتە بڕوا بەو دۆزانە دەهێنیت کە لە یەکێک لە ڕۆژنامەکاندا وتارێک دەربارەیان دەخوێنیتەوە، چونکە نە متمانە بە دیدەکانت، نە بە گوێیەکانت دەکەیت. تۆ ڕێز لەو کەسانە دەگریت کە ڕقیان لێت دەبێتەوە، گرگن! ڕقت لە خۆت دەبێتەوە، هەر لەبەر ئەوەیشە کە متمانە بە هەست و نەستەکانی خۆت ناکەیت و جێی بڕوات نین. کاتێکیش ڕۆژنامەکان لەسەر کارەکانی ئەو دەنووسن، دێیت، نەک ئارام و هێمن، بە جۆرێک نا کە جێی خۆشحاڵی و خەنیبوون بێت، بەڵکو بە هەڵەداوان و پەلەپرووسکێ دێیت و بانگی "بلیمەتی"ی ئەو داهێنەرە دەدەیت؛ ئەو داهێنەرەی کە بەر لە ماوەیەک بە فریودەر و هەڵخەڵەتێن و بە بەرازێک کە سەراپای لە چڵپاوی جنسدا نقووم بووە، ناوت دەبرد؛ ئەو داهێنەرەی بەر لە ماوەیەک بە دەستبڕ و ساختەچی، بە کەسێکی ترسناک کە ئاکارە باو و گشتییەکانی نێو کۆمەڵەکەت تێک دەدات و لە گرێژنەیان دەبات، ناو دەبرد، دەکەیت بە بلیمەت.

تۆ نازانیت "بلیمەت" چییە، پیاوی بچووک!

دەزانم کە ئەمەیش نازانیت، چۆن نازانیت جوولەکە کێیە و ڕاستی و بەختیاری چیین.

من پێت دەڵێم، بە هەمان شێوە کە جارێک لە جاران جاک لندن لە کتێبەکەیدا؛ مارتین ئێدن، پێی وتویت؛ دڵنیام ملیۆنانی وەک تۆ ئەو کتێبەیان خوێندۆتەوە، بەڵام تێی نەگەیشتوون. "بلیمەتانە: "ئەو ئەتەکێتەیە دەیدەیت لەو شتومەکانەی بەرهەمت هێناون، کاتێک بۆ فرۆشتن بۆ بازاڕەکان دەیانبەیت!"

ئەگەر ئەو داهێنەرەی تا دەمێک لەمەوبەر بەرازێکی نقوومبووی ناو زەلکاوی جنس بوو، شیتێک بوو، ئێستا "بلیمەت"ێک بێت، ئەوا بۆ تۆ زۆر ئاسانترە ئەو بەختیارییەی ئەو بۆ دنیاکەت بە دەستی هێناوە، هەڵلووشیت. ئێستا هەڵلووشینی بەختیاری بۆ تۆ، گەلێک ساناترە، چونکە تەنیا نیت و چەندان پیاوی بستەباڵا و بچووکی ترت ـ مینا خودی خۆت ـ لەگەڵدایە و هەموو پێکڕا هاوار دەکەن: "بلیمەت، بلیمەت!". خەڵکی دەستە دەستە و ڕیز بە ڕیز دێن و بەرهەمی نێو دەستەکانت چڵێسانە هەڵدەلووشن و دەیخۆن. ئەگەر پزیشکێک بیت، چەندان نەخۆش ڕووت تێدەکەن. لە تواناتدا هەیە گەلێک چاکتر لە بەرێ یارمەتیان بدەیت و بەوەیش پارەیەکی زۆر خڕ بکەیتەوە و بە دەست بهێنیت. گوێم لێتە پیاوی بچووک دەڵێیت: "ئەمجا بەدەستهێنانی پارە چ قەیدی هەیە و بۆ خراپە!" لەڕاستیشدا وایە، بەدەستهێنانی پارە بە ڕێگایەکی ڕاست و لەبریی کار و خزمەتێکی چاک، خەوشێک نییە، بەڵام ئەوە خەوش و هەڵەیە ئەگەر لەو پارەیەی بە دەستی دەهێنیت هیچ لە پێناوی توێژینەوەکەت و بەردەوامبوونیدا بە کار نەهێنیت و گوێی پێ نەدەیت، بەڵکو لەبریی ئەوە توێژینەوەکەت بۆ زیاتر زەنگینبوون بە کار بهێنیت.

ئەمەیش ئەوەیە کتومت کردوتە و دەیکەیت.

تۆ هیچ شتێک ناکەیت تا بەردەوامی بدات بە توێژینەوەکانت و بەرەوپێشچوونیان، لەبریی ئەوە بەبێ بیرکردنەوە و بەوپەڕی چڵێسی و دەبەنگییەوە دەستی بەسەردا دەگریت. نە سنوور و نە ئەو توانستەی لە ئەنجامی توێژینەوەوە بە دەست دێت، نابینیت. جۆری ژیان و بوونت بەرپەرچی ئەو توانستانەی هەن دەدەنەوە. لە هەر جێیەکیش بگەیت بەو سنوورانەی دەوری ئەنجامدانی توێژینەوەکانتی داوە، ئاودیو دەبیت. ئەگەر پزیشکێک، یا بەکترۆلۆژێک بیت کە لە بارەی نەخۆشیی کولێرا و گرانەتاوە بزانێت کە ئەو نەخۆشییانە دەرئەنجامی هەڵامسانن لە ئەندامێک لە ئەندامەکانی لەشدا، ئەوا بەوپەڕی دڵنیاییەوە، بە دوای بەشی

هەڵامساندا دەگەڕێیت لە بواری نەخۆشییەکانی شێرپەنجەدا و بەو جۆرەیش دەمێکی دوورودرێژ لە کاتەکەت بەوە لە دەست دەدەیت کە بە دوای باسیلەکانی شێرپەنجەدا بگەڕێیت. جارێکیان لە پیاوێکی گەورەوە فێر بوویت کە ئامێرەکان بەپێی چەند یاسا و ڕێسایەکی تایبەت و دیاریکراو بۆیان کار دەکەن، هەربۆیە چەند ئامێرێکت بە مەبەستی کوشتن دروست کرد؛ لەو بڕوایەشدایت کە بوونەوەرە زیندووەکانیش وەک ئامێر وەهان و بە هەمان یاسا و ڕێسای ئامێرەکان دەکرێت بە کار بهێنرێن، هەر بۆیەیشە لەسەر هەمان هەڵە بەردەوامیت کە دەمێکی درێژە بە دەستیەوە دەتلێیتەوە و بە خۆیەوە لوولی داویت. تۆ چەندان کاری زانستیت وەلاناوە، هەر بەو هەست و نەستانەوە کە پێت وایە ڕاستن و نکوڵی لە بەڵگەنەویستیان ناکرێت، وەرتگرتوون. لەمەیش بترازێت، بوویت بە خولقێنەرەی چەندان هەڵە و شێواندن لەسەر بوونەوەرە زیندووەکان، چونکە پێت وا بووە کە ئەم هەڵەیە، ئەو مافانەی پێت بەخشراون وەک زانایەک کار بکەیت، یا بە هۆی دین و لەبەر خاتری دەفتەرەکانی پارەپاشەکەوتکردنت لە بانکەکاندا، یا هەر لەبەر ئەوەی سروشتێکی ڕێگرانەت هەیە لە بەجێهێنانی کاری زانستیدا، توانیوتە ئەو کەسانە زیندانی بکەیت و ڕاویان بنێیت و دووریان بخەیتەوە، یا لە بەردەم و لە پاشملە بە خراپە دەربارەیان بدوێیت، لەسەر ئەو ڕێگا ڕاستە لایان بدەیت کە مژدەبەخشی بەدەستهێنان و ئەنجامدانی کاری زانستیی مەزن بوون. دەزانم! دەخوازیت "بلیمەتان" هەبن و بۆ خۆیشت ئامادەیت بە شانوباڵیاندا هەڵبدەیت و بکەویتە پەسندانیان، بەڵام "تۆ" بلیمەتی "چاک"ت دەوێت، بلیمەتی باشپەروەردەکراو، بلیمەتێکت دەوێت پێ بە قەد بەڕەکەی خۆی ڕابکێشێت و هەراوهۆریا و کێشەت بۆ نەنێتەوە، بلیمەتێکت ناوێت کەوی و ڕام نەبێت و بیەوێت بەسەر گشت سنوورەکاندا ئاودیو بێت، هەموو ئاستەنگەکانی سەر ڕێی تێکوپێک بدات و بیانشکێنێت. تۆ بلیمەتێکی سنووربۆکێشراو، باڵکراو، شیک و پاکژت دەوێت، تا بتوانیت بەبێ ئەوەی شەرم داتبگرێت شانبەشانی خۆت بە شەقامەکانی شارەکانتدا بیگەڕێنیت!

تۆ توانایەکی باشت هەیە لە هەڵلووشین و لەبۆخۆدەستخستندا، بەڵام ناتوانیت بخوڵقێنیت. هەربۆیە بەو جۆرەی کە هەیت، هەربۆیە تەواوی ژیانت یا لە نووسینگەیەکی ناجۆر و دڵپروێندا بەسەر دەبەیت، یا هەر خەریکی ژماردن و کۆکردنەوە و لێدەرکردنی ژمارەکانیت، یا خۆت بەسەر مێزەکەتدا چەماندۆتەوە و خەریکی نەخشەکێشان و پلاندانانی، یا ژیانی بەناچاریی ژنومێردایەتی هێزی لە بەر بڕیویت، یا مامۆستایەکیت لە پۆلێک لە پۆلەکاندا، هەرچەند هیچ خۆشەویستییەکت بۆ منداڵان نییە و ڕقت لێیان دەبێتەوە. هەر لەبەر ئەوەیش کە هەمیشە و بەردەوام لەوەی ئامادە و لەبەردەستدا هەبووە، وەرتگرتووە و قەت نەتتوانیوە ببەخشیت و بدەیتەوە، نایشتوانیت بەرەوپێش بچیت و بگەیت بە پلەیەکی باڵاتر، قەتیش هزرێکی نوێ لە دەرگای بیرت نادات. تەنیا ئەوەندەت لە باردا بووە، ئەوەی خەڵکانی تر پوخت و ئامادە لە بەردەمیاندا داناویت، هەڵلووشیت و بیکەیت بەو دیودا.

نابینیت بۆ هیچ گۆڕانکارییەک، هیچ جیاوازییەک، نە لە خۆت و نە لە دەوروبەرەکەتدا ڕوو نادەن؟

لێگەڕێ بۆت بگێڕمەوە:

کاتێک دڵتەنگ و هیچلەناخدانەبوو، بە گازندەوە، دڵ پڕ لە سکاڵا لە دەست ڕەحەتنەبوون، یا بە خۆت و نەخۆشییە دەروونییەکانتەوە، بەرەو ڕووم دێیت و داوای یارمەتیم لێ دەکەیت، فێربووم چۆن مینا گیانەوەرێکی ڕەقوتەق و وشکهەڵاتوو؛ گیانەوەرێکی لە جێی خۆدا چەقیو، بتناسم و هەست بە بوونت بکەم. لە تواناتدا نییە ببەخشیت و بخوڵقێنیت، تەنیا چڵێسی و بۆخۆبردن و هەڵلووشین دەزانیت، چونکە ئەو بارە بنچینەییانەی لەشتیان پێکهێناوە بریتین لە: خۆبەدوورگرتن، بۆخۆسەندن و ڕکەبەری و بەربەرەکانی. هەر ئەوەندەی پێکهاتە بنچینەیی و ساکارەکانی ئەوین یا دڵاوایی لەنێوتدا بکەونە بزووتن، زارەترەک دەبیت و دەتۆقێیت. ڕژدی و چڵێسیت تەنیا یەک نێوەڕۆکی بنەڕەتی هەیە: چونکە هەست

دەکەیت سک بەتاڵ، نەفام و لەبرساندا مردوویت، چونکە هەست دەکەیت نە زانیاریی ڕاستەقینەت لە دەستدایە و نە بە دوای بەدەستخستنیدا دەگەڕێیت، هەمیشە و بەردوام ناچاریت بەوەی ورگی خۆت لە پارە و خواردن و بەختیاری و زانیاری پڕ بکەیت. هەر لەبەر ئەم هۆیەیشە کە لە هەقیقەت هەڵدێیت و خۆ دەرباز دەکەیت، پیاوی بچووک!

هەقیقەت دەیتوانی لە دەست شەوقدانەوەی ئەوین و خۆشەویستیی نێو ناخت قوتارت بکات. هەقیقەت دەیتوانی ـ یا دەکرا هەقیقەت ـ ئەوەت پێشان بدات کە من نیوەناچڵ و ناتەواو هەوڵ دەدەم پێشانت بدەم، بەڵام تۆ ئەمە ناخوازیت، گرگن! دەتەوێت تەنیا کڕیار و بەکارهێن، دەتەوێت نیشتمانپەروەر بیت.

"گوێی لێ بگرن! دەیەوێت نکوڵی لە نیشتمانپەروەری بکات. نیشتمانپەروەری کە بەردی بناغەی دەوڵەت و یەکە پێکهێنەرەکەیەتی: خێزان! دەبێت ڕێ بەمە نەدرێت و بەری لێ بگیرێت!"

بڕوانە چۆن دەقیژێنیت، کاتێک یەکێک لە بارە دەروونییە ڕەقهەڵاتووەکەت ئاگادارت دەکاتەوە.

نە دەتەوێت گوێت لەم ئاگاداربوونەوەیە بێت، نە لە بارەیەوە بزانیت. تەنیا دەتەوێت بقیژێنیت، هاتوهاوار بکەیت و چەپڵە لێ بدەیت. ڕێ لە هاتوهاوار و قیژەقیژ و پیداهەڵگوتن و چەپڵەلێدانت ناگرم، بەڵام ڕێ نادەیت بە هێمنی و بە کاوەخۆ بۆت بگێڕمەوە کە بۆ ناتوانیت بەختیاری بە دەست بهێنیت.

ترس لە چاوەکانتدا بە دی دەکەم، چونکە دەزانم ئەم پرسە بە چ قووڵاییەک دەتبزوێنێت. تۆ "نەرمونیانی و حەوسەڵەیەکی زیادلەپێویست بۆ دینەکەت" دەخوازیت و داوا دەکەیت سەربەست و ئازاد دینەکەتت خۆش بووێت؛ ئەگەرچی ئەمە نەک خەوش و هەڵەیەک نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە کارێکی باش و بەسوودیشە،

بەڵام لەمە زیاتر دەخوازیت و دەتەوێت هەموو کەسێکی دیکەیش شوێنپێی تۆ هەڵبگرێت و ملکەچ و گوێڕایەڵی یاسا و نەریتە ئایینییەکانی تۆ بێت. لەگەڵ دینەکەی خۆتدا نەرمونیان و بەحەوسەڵەیت، بەڵام ئەم نەرمونیانییە بە هیچ دینێکی تر بە ڕەوا نابینیت. شێت و هار دەبیت، ئەگەر کەسێک لەبریی پەرستنی خوایەکی تایبەت، سروشتی خۆش بوویت و هەوڵ بدات لێی تێبگات.

کاتێک ژن و مێردێک هەست بەوە دەکەن کە چیی تر ناتوانن پێکەوە بژین، دەتەوێت یەکێکیان ئەوی تر بە شکایەت و بیانووی ڕێزنەگرتن لە خوونەریتە باوەکانی نێو کۆمەڵ، یا بە ناوی کەللەڕەقی و ملنەونەکردنەوە بۆ یاساکان، بەرەو دەروازەی دادگاکان ڕاپێچ بکات.

تۆ؛ پیاوە گرگنە لێقەوماوە کەتنگێڕە گەورەکە، باوەڕت بە لێکجودابوونەوەی ژن و مێرد نییە، کە لەسەر بنچینەی تێگەیشتن لە یەکتر بونیاد نراوە. لەو تاموچێژەی لە ژیانت دەیبینیت، لە حەز و ئارەزووەکانت، دەترسیت. بینینی هەقیقەتت تەنیا لە ئاوێنەدا دەوێت، چونکە لەوێدا نە تۆ دەتوانیت بیگریت و نە ئەویش دەتوانێت بتگاتێ. "نەتەوەپەرستی"ت دەرئەنجامی ئەو بارە ڕەقهەڵاتووە لە جێی خۆدا گیرخواردووەی لەشت و بارە دەروونییە قەبز و بەبەردبووەکەتە، گرگن! بە مەبەستی تیزپێوەکردن و سووکایەتی ئەمەت پێ ڕاناگەیەنم، چونکە هاوڕێتم؛ هەرچەندە دەزانم کە تۆ هاوڕێیەکانت هەر لەبەر ئەوەی لە بارەی ڕاستییەکانەوە بۆت دەپەیڤن، دەکوژیت. سەیرێکی نیشتمانپەروەرەکانت بکە و دەبینیت لەبریی ئەوەی ئاسایی بڕۆن مارش دەکەن. نیشتمانپەروەرەکانت ڕقیان لە دوژمنەکانت نییە، بەڵکو لەبریی ئەوە "دوژمنانی بە میرات بۆ ماوە"یان هەیە؛ دوژمنانێک کە لە دەمێکەوە بۆ دەمێکی تر دەیانگۆڕن و دەیانکەن بە هاوڕێیانی تەمەنی خۆیان و دواتریش دەیانکەنەوە بە دوژمنانی خوێنەخۆری خۆیان. نیشتمانپەروەرەکانت گۆرانیی ئاسایی ناچڕن، بەڵکو سروودی جەنگ دەڵێن. کچەدۆستەکانیان

لە ئامێز ناگرن، بەڵکو "دەیاننێنە ژێر" و "ئەو جارانە دەژمێرن" کە لە شەوێکدا گانیان لەگەڵدا دەکەن. پێت ناکرێت ئەم ڕاستییە لە بەین بەریت و بەرپەرچی بدەیتەوە، تەنیا کارێکی خراپ کە پێت دەکریت ئەوەیە بمکوژیت؛ وەک چۆن چەندان لە هاوڕێ ڕاستەقینەکانی خۆتت مەسیح، ڕاتێناو، کارل لیبکنێختی دڵگەرم و لنکۆڵن و چەندانی ترت کوشت. نیشتمانپەروەری کوشتویتی و لە نێوی بردویت. ئەوە تۆیت و کەسی تر نییە کە لە چەشنی ملیۆنان کەسی تردا شەقلەپاشەڵهەڵدراو و پێپێدانراویت، بەڵام لە نیشتمانپەروەریی خۆت ناکەویت و بەردەوامیت.



*بۆیە وەک دزێک لە تاریکەشەودا هەڵدەکوتیتە سەر بەختیاری و دەیدزیت.*

تۆ تاسە و ئارەزووی ئەوین دەکەیت، کارەکەتت خۆش دەوێت، چونکە بژێویت پێ دەدات، کارەکەیشت بە توانست و زانیارییەکانی من دەژی، توانست و زانیارییەکانی منیش بە توانست و زانیاریی کەسانی تر دەژی. ئەوین و کار و زانیاری و توانستەکان، هیچ وڵاتێک، هیچ سنوورێک، هیچ جۆرە جلکێکی ڕەسمی ناناسن و

نێونەتەوەیین، بۆ گشت مرۆڤانن، گشتی و هەمەلایەنەن، بەڵام تۆ دەتەوێت نیشتمانپەروەرێکی تەپەسەر و گرگن بیت، چونکە لە ئەوینی ڕاستەقینە دەترسیت، لەوە دەترسیت بەرپرسێتیی کارەکەت لە ئەستۆ بگریت و لە بەدەستخستنی توانست و زانیاریش تۆقیویت. هەر لەبەر ئەمەیش تەنیا ئەوەت لە دەست دێت ئەوین و کار و زانیاری و توانستی کەسانی تر بۆ مەرامەکانی خۆت بە کار بهێنیت، بەڵام قەت ناتوانیت خۆت شتێک بخوڵقێنیت. هەر لەبەر ئەمەیشە، مینا دزێک لە تاریکەشەودا هەڵدەکوتیتە سەر بەختیاری و دەیدزیت. ئێرەیی سەروسیمات شین و مۆر دەکاتەوە، ئەگەر بێت و بەختیاری لە کەسانی تردا بە دی بکەیت.

"ئەم دزە بگرن! هاووڵات نییە و پەناهێنە بیگرن! بەڵام من هاوزێدی ئەڵمانیاییەکان، ئەمەریکاییەکان، دانمارکییەکان و نەرویجییەکانم!"

گەڤە و شیرەشیرِ گرگن!

تۆ ئەو پەناهێنە تاهەتایی و بێبڕانەوەیەیت کە لە ئاکامی ڕوودانی کارەساتێکدا ڕووت لەم دنیایە کرد و ڕۆژێکیش دێت ئارام و بێدەنگ بە جێی دەهێڵیت. تۆ بۆیە دەقیژێنیت و هاوار دەکەیت، چونکە دەترسیت و تۆقیویت. هەست دەکەیت چۆن لەشت ڕەقوتەق هەڵاتووە و بەرەبەرە وشک دەبێتەوە. لەبەر ئەوەیە بە هەڵەداوان و پەلەپرووسکێ خۆت دەگەیەنیتە پۆلیسەکانت، بەڵام پۆلیسەکانیشت هیچ دەستەڵاتێکیان بەسەر ڕاستییەکانی مندا ناشکێت. پۆلیسەکانیشت، مینا خەڵکی تر، بە گازندە و دڵ پڕ لە سکاڵا لە دەست ژنەکانیان، لە دەست منداڵە نەخۆشەکانیان، دێنە لای من. ئەوان، ئەو مرۆڤانەی لە ناخیاندا هەن بەوە دەشارنەوە و حەشار دەدەن کە جلکی ڕەسمی لە بەر بکەن و چەک لە خۆیان ببەستن، بەڵام ناتوانن خۆ لە من پەنا بگرن و بشارنەوە، چونکە چەندان جار بە ڕووتوقووتی بینیومن.

"ناو و نیشانی لای پۆلیس هەن؟ هیچ غەلوخەشێک لە

پێناسنامەکانیدا هەیە؟ باجی دەوڵەتی داوە؟ لێی بکۆڵنەوە، دەبێت مەرام و خواستەکانی دەوڵەت و ئابرووی نەتەوە بپارێزرێن!"

ئا، پیاوی بچووک! دڵنیا بە هیچ غەلوخەشێک لە پێناسەکانمدا نییە و هەمیشە باجیشم داوە بە دەوڵەت. ئەوەی تۆی دوودڵ و سەراسیمە کردووە پاراستنی مەرام و خواستەکانی دەوڵەت و پاریزگاریکردنی ئابرووی نەتەوە نییە، تۆ لەوە تۆقیویت چۆن ڕووتوقووت لە ژووری کارکردن و لە ئەنجامی توێژینەوەکانمدا بینیومیت پێشانی دنیات بدەم و پەردە لەسەر ڕازەکانت هەڵبماڵم، لەبەر ئەوەیە ئاوها خۆت پەرێشان و سەخڵەت کردووە، بۆ ئەوەی بە بیانووی ملنەوینەکردن و پشێوینانەوە فڕێم بدەیتە زیندانەوە.

دەتناسم پیاوی بچووک! ئەگەر ڕێکەوت دادوەرێکی گشتی بیت، ئامانجت ئەوە نابێت داد و یەکسانی بچەسپێنیت، بەڵکو بە دوای "کێشە"یەکدا دەگەڕێیت پلەوپایەیەکی بڵندترت پێ ببەخشێت، بتگەیەنێتە پلەی "دادوەری دادوەران". دادوەرە گرگنەکانی سەرووی خۆیشت هەر ئەوەیان دەوێت. هەر هەمان کاریشتان بەرانبەر بە سۆکرات کرد، بەڵام تۆ هیچ دەرسێک لە مێژوو وەرناگریت. سۆکراتت کوشت، بۆیە ئاوها لەو زەلکاوەدا کە دەمێکە تا بینەقاقات هەڵکشاوە، ماویتەتەوە. سوکراتت کوشت و تا ئێستایش هیچ شتێک لەو بارەوە نازانیت. بەوە تاوانبارت کرد کە "ڕەوشتە جوانەکان!"ی نێو کۆمەڵەکەت گۆڕەوشار دەکات، بەڵام ئەو تا هەنووکەیش هەر لەسەر هەمان کار هەر بەردەوامە، گرگن! تۆ توانیت لەشی ئەو بە خاک بسپێریت، بەڵام بیرەکانی ئەو تا ئێستایش هەر مژدەبەخش و زیندوون. تۆ تا ئێستایش بە پەنابردنە بەر "یاسا و ڕێسا"کانت هەر خەریکی هەمان کار و گۆڕەوشارکردنی، بەڵام نەک ئازا و بوێرانە، بەڵکو بە شێوەیەکی ترسنۆکانە و خوێڕییانە ئەو کارە ئەنجام دەدەیت.

کاتێک بە بیانووی گوێپێنەدان و بەرپەرچدانەوەی ڕەوشتە باوەکانی نێو کۆمەڵەکەت تاوانبارم دەکەیت، ناتوانیت ڕووبەڕووم

ڕابوەستیت و سەیری چاوم بکەیت، چونکە دەزانیت کاممان شلوشەویق و چڵێس و بێئاکار و بێڕەوشت و پڵتۆخین.

کەسێک لە دەرفەتێکدا پێی وتیت، کە لەنێو گشت هاوڕێ و دۆستەکانیدا، لەنێو تەواوی ناسیاوان و برادەرانیدا، تەنیا یەک کەسی دیوە لە بارەی جنسەوە گاڵتەوگەپێکی نەگێڕابێتەوە و ئەو کەسەیش من بووم، پیاوی بچووک! گرنگ نییە تۆ دادوەرێکی گشتی، دادوەرێـک، یا بەڕێوەبەری پۆلیس بیت کاتێک گوێ بۆ ئەم قسەیە شل دەکەیت، چونکە من لە گشت گاڵتەوگەپە پووت و ناحەزەکانت ئاگادارم و دەزانم لە چ سەرچاوەیەکەوە هەڵدەقووڵێن، بۆیە فەرمان دەدەم کە بێدەنگ بیت.

دەشێت لە تواناتدا بووبێت ئەوە پێشان بدەیت کە ساڵێک لە ساڵان باجی تەواوم لەسەر داهاتی ساڵانەم بە دەوڵەت نەدابێت، یا ئەوە بسەلمێنیت کە لەگەڵ ژنێکدا بەسەر یەکێک لە سنوورە کێشراوەکانتدا، سنووری یەکێک لە هەرێمەکانتدا، ئاودیو بووبم، یا ئاشکرای بکەیت کە لەگەڵ منداڵێک لە منداڵەکانی کۆڵانەکانتدا، دڵ پڕ لە حەز و دۆستانە، دوابێتم، بەڵام تاموچێژی ئەمانە تەنیا لە دەمی تۆدا ناخۆش و گەمارە، نەک هی من. لەبەر ئەوەی هیچ شتێکی تر ناناسیت، لەو بڕوایەدایت منیش یەکێک بم، مینا خودی خۆت. مخابن، پیاوی بچووک! من سەبارەت بەم شتانە وەک تۆ نیم و قەتیش وەک تۆ نەبووم. گرنگیش نییە باوەڕ دەکەیت یا نا. تۆ بۆ دڵنیابوون و خۆپاراستن چەک و منیش تەنیا توانست و زانیارییم لە دەستدایە. هەر کەسەیش بەرەو ئەو لایە دەڕوات، کە دڵ دەیخوازێت.

لێگەڕێ بۆت بگێڕمەوە کە چۆن ژیانت لە خۆت هەراسان کردووە و لە کارت خستووە، گرگن!

ساڵی ١٩٢٤ پێشنیازی توێژینەوەیەکی زانستیم کرد لەسەر کەسایەتیی مرۆڤ و بە شەوق و گەرموگوڕییەوە بەرەو

پیری هاتیت. ساڵی ١٩٢٨ کارەکەمان بەرەو ئەنجامێکی دیار و لەبەرچاوی دەبردین و ئەو کاتیش تۆ هەر بە شەوق و خۆشییەوە بەرەو پیری دەچوویت، نەک هەر ئەمەیش، بگرە بە "بیرکارێکی بەبایەخ" ناودێریت کردم.

ساڵی ١٩٣٣ ئەو دۆزینەوە زانستییەم لە شێوەی کتێبێکدا، لەڕێی بنکەی چاپ و بڵاوکردنەوەکەی خۆتەوە، بڵاو کردەوە. ئەو کات تازە هێتلەر دەستەڵاتی گرتبووە دەست. بەر لەوەیش فێرم کردبوویت لەوە تێ بگەیت کە هۆکاری بەهێزبوونی هێتلەر ڕەقهەڵاتن و بەبەردبوونی کەسایەتیی تۆ بوو. تۆ ڕێت نەدا کتێبەکە بڵاو ببێتەوە، چونکە لەوێدا ئەوەم پێشاندابوو کە تەنیا تۆ و کەسی تر نا بەرهەمێنی هێتلەریت. هەر چۆنێک بێت کتێبەکە بڵاو بووەوە و تۆ تا ئەو کاتیش هەر بە شەوق و گەرموگوڕ بوویت بەرانبەر، بەڵام هاوکات بە بێدەنگی کوشتت. چونکە "سەرکۆمار"ەکەت نەفرەتی لەو کتێبە کردبوو. بێجگە لەوەیش ئامۆژگاریی دایکەکانی کردبوو کە منداڵەکانیان لەسەر دانبەخۆداگرتن ڕابهێنن، تا لەو ڕێگایەوە بەر لە هەموو هەست و نەستە ڕاستەقینە و پوختەکانیان بگرن.

سەرباری ئەو گەرموگوڕی و بەدەنگەوەهاتنەت، بە درێژاییی دوانزە ساڵ، بە بێدەنگبوونت، کتێبەکەی منت بە دەستی مەرگ سپارد و ساڵی ١٩٤٥ کە دووبارە کتێبەکە چاپکرا و بڵاو کرایەوە، بەنێوی "کلاسیک"ەوە کەوتیتە سەناکردن و پێداهەڵدانی، ئەوسایش هەر هەمان گەرموگوڕیت بەرانبەری هەبوو.

بیستودوو ساڵ، بیستودوو ساڵی پڕ لە ڕووداو، پڕ لە پەرێشانی و دوودڵی بەسەر ئەو دەمەدا تێپەڕبووە کە تێیدا فێرم کردیت گرنگ چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکانی تاکەکەس نییە، بەڵکو گرنگ ڕێگرتن و ڕێنەدانە بە تەشەناکردن و بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشییانە. بە درێژایی بیست و دوو ساڵی دڵتەزێن و ناخۆش فێرم کردیت خەڵکی بۆیە تووشی داوی ئەم نەگبەتی یا ئەو کلۆڵی

دەبن، ئەم شێتی یا ئەو شێتی گاڵەیان پێ دەکات، چونکە هەم بە لەش و هەمیش بە ڕۆح بوون بە بەرد و ڕەقهەڵاتوون، چونکە نە دەتوانن خۆشەویستی ببەخشن و نە تاموچێژی لێ وەربگرن، چونکە لەشیان وەک گیانەوەرانی تر لە کاتی خۆشەویستیکردندا بە موچڕکەی هاتنەوەیەک و خاوبوونەوەی ماسوولکەکان ڕانەهاتووە، بیست و دوو ساڵی ڕەبەق دوای ئەوە، دێیت و بە هاوڕێیەکانت دەڵێیت: "گرنگ چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکانی تاکەکەس نییە، گرنگ ڕێگرتن و ڕێنەدانە بە تەشەناکردن و بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشییانە." و هاوکاتیش هەر هەمان کار دەکەیتەوە کە بە درێژایی هەزاران ساڵ کردووتە: "ناوی ئامانجە گەورەکان دەبەیت و لە بارەیانەوە دەدوێیت، بەبێ ئەوەی ئەوە دیار بکەیت کە مرۆڤ چۆن پێیان دەگات، چۆن بە دەستیان دەهێنێت." تۆ ژیانی خۆشویستن و ئەوینی خەڵکانی بێشومار لە بیر دەکەیت. دەتەوێت، یا دەڵێیت، دەبێت "ڕێ لە ئازارە دەروونییەکان بگیرێت"، بەڵام ناتەوێت خۆت لە قەرەی ئەو بەدبەختییە جنسییە بدەیت کە خەڵکی بە دەستیەوە دەناڵێنن، ئەمەیان قەدەغەیە! وەک پزیشکێکیش هێشتا سەرت لەو زەلکاوە دەرنەهێناوە کە تێی کەوتویت.



*دەقیژێنیت و هاوار دەکەیت، چونکە دەترسیت.*

چۆن لە تەکنیککارێک کە هونەری فڕین دەدۆزیتـەوە دەفکریت! کاتێک هیچ زانیارییەکت لە بارەی چۆنێتیی بەکارهێنانی مۆتۆڕ و پەروانەکانەوە پێ ڕاناگەیەنێت، ئاوهایش، بەبێ کەم و زیاد، ئەو تەکنیککارانەی بە چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکانتەوە خەریکن دەخولقێنیت. تۆ، مرۆڤێکی بێورە و ترسنۆکیت. دەتەوێت شتە باشەکان هەڵبژێریت و خراپەکان وەلانێیت. گوڵەباخی بێدڕک دەخوازیت. ئەی تۆ، ئەی ئەو گرگنەی بە چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکانەوە خەریکیت، چەندان گاڵتەوگەپی بێمانا و هیچوپووچی جنسیت لە بارەی منەوە دروست نەکردووە؟ بە ناوی "پەیامبەری گەیشتن بە ڕەحەتبوونێکی چاکتر"ەوە دوام نەکەوتویت؟ قەت گریە وناڵەی ئەو ژنە گەنجانەت بەر گوێ نەکەوتووە کە ژیانیان بۆتە مەخسەرە بە دەست ئەو پیاوانەوە کە ڕەحەت نابن؟ یا پەشیمانی و پەنجەی خۆ گەستنی ئەو لاوانەت نەبیستووە کە ڕەحەتنەبوون لە خۆشەویستیدا تەقاندونیەتیەوە؟ دڵنیایی و خۆپاراستنت هێشتا لە نەخۆشەکانت گرنگترن؟ تا کەی بەدەستهێنانی پلەوپایەی بەرزتر لە پێشتر دەگریت، لە پرسە پزیشکییەکانت؟ تا کەی خۆ لەو ڕاستییە لا دەدەیت، کە هەڵگرتنی ئیشی ئەمڕۆ بۆ سبەی، ئەم هەڵسوکەوت و مامەڵە تاریک و نووتەکەت، ژیانی ملیۆنان مرۆڤی پێوە بەندە؟ تۆ دڵنیایی و خۆپاراستن بەر لە هەقیقەت دادەنێیت. کاتێک لە بارەی "ئۆرگۆن"ەوە دەبیستیت، کە من دۆزیومەتەوە، ناپرسیت: "ئاخۆ چ کەڵکێکی هەیە؟ چۆن نەخۆشان چاک دەکاتەوە؟" بەڵکو دەپرسێت: "ئایا مۆڵەتی ئەوەی دراوەتێ بە کاری پزیشکییەوە خەریک بێت؟"

لەوە تێ ناگەیت کە مۆڵەتدانی تۆ و بەڵگەنامە بێمانا و پڕوپووچەکانت هیچ خێرێکیان نییە لەوە زیاتر کە پچەک کارەکەم تێک بدەن، بەڵام ناتوانن ڕێی ئەنجامدانیم لێ بگرن، من ئیدی لە سەرانسەری ئەم زەمینەدا، مینا دۆزەرەوەی دەردی هەست و نەستەکانت، مینا دۆزەرەوەی وزە و توانی ژیانت، ناسراوم و دان بە توانستی زانستیمدا نراوە، کەسێکیش کە لە من زیاتر نەزانێت، ناتوانێت لە من بکۆڵێتەوە و مۆڵەتی کارکردنم بۆ بڕەخسێنێت.

سەربەستبوونی خۆت بە فیڕۆ دەدەیت. کەسێک لێی نەپرسیویت بۆ تا ئێستا نەتتوانیوە لە بەدەستهێنانی سەربەستی و ئازادبوونتدا لە هەنگاوی بەرەوپێشچووندا بیت، هیچ کەسێکیش لێی نەپرسیویت: "بۆ هەر ئەوەندە سەربەستی بە دەست بهێنیت، بە پەلە و سووک و ئاسان، لە دەستی دەدەیت و بە سەرووەرێکی نوێی دەسپێریت!"

تۆ دەپرسیت و دەڵێیت: "گوێتان لێ بوو؟ بە خۆیدا ڕادەپەرموێت لە ڕابوونی شۆڕشگێڕانەی کرێکارانی دنیا دوودڵ بێت! گومان لە دیموکراتی بکات! بمرێت ئەم شۆڕشگێڕە، بمرێت ئەم هەڵگەڕاوەیە لە شۆڕش! بمرێت."

خۆت سەغڵەت مەکە ڕابەرە پووت و هیچلەباردانەبووەکەی گشت دیموکراتەکان و تەواوی کرێکارانی دنیا، چونکە لەو بڕوایەدام سەربەستیی ڕاستەقینە و داهاتوویيت، تەنیا بە بەرسڤی ئەم تاکە "پرسە"وە بەندە، نەک بەو دەرئەنجامانەی لە کۆنگرەکانی پارتییەکەتدا بە دەستیان دەهێنیت.

تۆ دەڵێیت: "با بمرێت! دەیەوێت ئابرووی نەتەوە و نێوونێوبانگی جەنگاوەرانی کرێکارانی شۆڕشگێڕ لەکەدار بکات! با بمرێت! پاڵی بدەن بە دیوارەوە!"

هاتوهاوار و چەپڵەلێدان و پەسندان یەک هەنگاو لە ئامانجەکانت نزیکترت ناخەنەوە، پیاوی بچووک! تۆ لەو بڕوایەدایت دەتوانیت سەربەستیی خۆت بەوە بپارێزیت و دڵنیا بیت لێی، کە خەڵکی لە پاڵ دیوارەکاندا ڕیز بکەیت. چاکتر وایە سەیری ئاوێنەیەک بکەیت و لە خۆت بڕوانیت.

دەڵێیت: "با بمرێت!"

نەختێک دانبەخۆداگرتن، گرگن! من نامەوێت سووکایەتیت پێ بکەم، نامەوێت لە نرخت کەم بکەمەوە، تەنیا ئەوەندە دەخوازم پێشانت بدەم کە بۆ تا ئێستا نەتوانیوە سەربەستی بە دەست

بهێنیت، ئەگەر بە دەستیشت هێنابێت لە تواناتدا نەبووە بیپارێزیت. ئەمەت بە لاوە گرنگ نییە؟

"با بمرێت!"

بەبێ ئـەوەی دریـژەی پێ بدەین بۆت دەگێڕمەوە چۆن پیاوە گرگنەکەی ناخت هەر ئەوەندە بەری بۆ بەرەڵا بکرێت و پچەک سەربەستی بە دەست بهێنێت هەڵسوکەت دەکات. با وا دابنێین: تۆ قوتابییەکی لە یەکێک لە ئامۆژگاکاندا کە بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوە لە تەندروستیی جنسیی لاوان و منداڵان تەرخان کراوە. تۆ بە گەرموگوڕییەوە بە پیر ئەو "بیرە مژدەبەخش"ەوە دەچیت و دەتەوێت لە بەجێهێنانی ئەم ڕزگارییەدا بەشدار بیت.



*با بمرێت!*

ئەمە کتومت ئەوەیە کە لە ئامۆژگاکەمدا ڕووی دا: قوتابییەکانم بەسەر وردبینەکانیاندا چەمابوونەوە و لە گەردیلە پێکهێنەرەکانی خۆڵ ورد دەبوونـەوە و سەرنجیان دەدا، تۆیش ڕووتوقووت

لەناو "ئەکیومولاتۆری ئۆرگۆنی"ییەکەدا دانیشتبوویت، بۆ ئەوەی بێیت و لەو تێڕوانینەدا بەشداریمان بکەیت، بانگم کردیت. تۆیش ڕووتوقووت، نەک بە نیازی بەشداریکردن، بەڵکو تەنیا بۆ ئەوەی خۆت بەو کچ و ژنانەی هاتبوون بۆ دیدەنیکردنی ئامۆژگاکەمان پیشان بدەیت، هاتیت و لەبەر دەممماندا قووت بوویتەوە و منیش ناچار یەکسەر لەم کارەت ئاگادارم کردیت، بەڵام نە تۆ لەوە تێگەیشیت بۆ وامکرد و نە منیش لەوە تێگەیشتم بۆ تێنەگەیشتنی. دواتر، لە گفتوگۆیەکی دووررودرێژدا، دانت بەوەدا نا کە کتومت تێڕوانین و بۆچوونی تۆ لەسەر ئامۆژگایەک کە بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوەی تەندروستیی جنسی تەرخان کراوە، ئەوە بووە کە بەو جۆرە هەڵسوکەوت بکەیت، هەر زوویش بە هالیکاری و یارمەتیی من لەوە تێگەیشتیت کە لە ناخەوە ڕک و کینەت بەرانبەر ئامۆژگایەک کە لەسەر ئەو بیرە بنچینەییانە بونیاد نرابێت هەیە و هەر لەبەر ئەوەیش بەو جۆرە هەڵسوکەوتت کردبوو، کە کردبووت.

ئێستا چاکتر تێ دەگەیت؟ بێدەنگیت!؟ کەواتە با من بەردەوام بم.

نموونەیەکی تر لەسەر ئەوەی تۆ چۆن سەربەستبوونی خۆت بە فیرۆ دەدەیت: تۆ دەزانیت و منیش دەزانم و لە کەسیش شاراوە نییە، کە چۆن و بێبڕانەوە بە دەست برسێتیی جنسییەوە گیرت خواردووە، کە چەند چڵێس و بەهەڵپەیت کاتێک دەڕوانیتە هەر کەسێک لە جنسەکەی خۆت نەبێت، کە تۆ و هاوڕێیەکانت چۆن بێبڕانەوە پەردەکی ناحەز و ناپەسەند لە بارەی جنسەوە بۆ یەکتر دەگێڕنەوە، کە چ ئەندێشەیەکی پیس و پەڵۆخت هەیە و چۆن هەموو دیمەنێکی خۆشەویستی، مینا پێشچاوێکی ڕووتوقووت دەبینیت. شەوێک لە شەوان گوێم لە دەنگەدەنگی خۆت و هاوڕێیەکانت بوو، گوێم لێ بوو چۆن کۆڵان و شەقامەکانتان دابووە بەر و هاوارتان دەکرد: "کچمان دەوێت! کچمان دەوێت!"

شپرزە و سەراسیمە، لە ئاست ئەو بارە ناهەموارەی تێی کەوتبوویت،

چەندان یانەی تایبەتیم پێکهێنا بۆ ئەوەی بە بەشداربوونت تێیاندا هەوڵ بدەیت لەو کڵۆڵی و نەگبەتییە تێ بگەیت کە بە دەستیەوە دەتلێیتەوە و ئەنجام بەسەریاندا زاڵ ببیت. دەستە دەستە و پۆل پۆل ڕووت کردە ئەو کۆبوونەوانەی لەو یانانەدا پێک دەهێنران. بۆ پیاوی بچووک؟ لە سەرەتادا لەو بڕوایەدابووم کە گرنگییەکی تایبەت و پێداویستیت بۆ فێربوون لە ژیانەوە پاڵی پێوە ناویت، ڕوو لەو کۆبوونەوانە بکەیت. بەرە بەرە لەوە تێگەیشتم کە لەڕاستیدا چی بۆ ئەو کارەی هانداوویت. تۆ، پێت وا بوو، ئەو یانانە جێگای بەربەرەڵا و بەدناون بۆ ئەوەی تێیاندا، سووک و ئاسان، بێ ئەوەی هیچ خەرجییەک بخوازێت، چ کچێک بتەوێت و دڵت بیگرێت بە دەستی بهێنیت. کاتێکیش لە نیازت تێگەیشتم، دەرگاکانم بە ڕووتدا داخست و وەدەرم نایت، نەک لەبەر ئەوەی پێم وا بێت، بەیەکگەیشتن و بەدەستهێنانی کچێک لە ڕێگای ئەو یانانەوە کاری نەکردە بێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی تۆ مینا بەرازێکی پەڵۆخ و گەمار هەڵسوکەوتت دەکرد.

یانەکان دواییان هات و تۆیش جارێکی تر بەرەو زەلکاوەکەت گەڕایتەوە.

دەتەوێت شتێک بڵێیت؟

"بۆرژواکان، کرێکارانیان بە بەرتیل لە خشتە بردووە. ڕابەرایەتیی کرێکاران دەبێت بێتە دەنگ و هالیکاری بکات، دەبێت بە دەستێکی پۆلایین دوایی بەم تەقلەهەڤی و پاشاگەردانییە بهێنێت، سەرباری ئەمەیش، دەبێت کێشە جنسییەکانی کرێکاران خۆیان چارەسەر بۆ خۆیان بدۆزنەوە."

دەزانم، دەزانم نیازت لەم قسەیەک چییە، گرگن! کتومت هەر ئەوەیش بوو لە "زێدی کرێکاران"دا سەروەرەکانت ڕێیان بۆ خۆش کرد، ئەوان دەستیان لە دۆزینەوەی چارە بۆ کێشە جنسییەکان بەر دا و ڕێیان بۆ خۆش کردن خۆیان چارەسەری

خۆیان بکەن. ئەنجامی ئەو کارەیشیان لە بەرلین کەوتە پێش چاومان، کاتێک "سەربازەکرێکارەکان"ت، شەو لە دوای شەو و بێبڕانەوە، دەستدرێژییان دەکردە سەر نامووسی ژنان. بێدەنگ بە! خۆیشت دەزانیت ئەمە ڕاستییەکە ئاو لێڵ ناکات!



*شەوانی بەرلین!*

جەنگاوەرەکانت؛ ئەوانەی بۆ پارێزگاریکردن لە "ئابرووی شۆڕشگێڕانە"ت دەجەنگن، سەربازەکانت؛ ئەوانەی بۆ "سەرکەوتنی کرێکارانی دنیا" لە شەڕدان، بۆ چەندان چاخی تری داهاتوویش، هێندە لە چڵپاو و پیسییان هەڵکێشاویت، بەست بێت.

تۆ دەڵێیت: "ئەم کارانە تەنیا لە "کاتی جەنگ و بەرپابوونیدا" ڕوو دەدەن!"

ئێستا چیرۆکێکی تری ڕاستەقینەت بۆ دەگێڕمەوە:

ڕابەرێک لە ڕابەرەکانت کە تا ئەودەمە دەستەڵاتی تەواوی نەکەوتبووە ژێر جنگ و یەکێک بوو لە ڕێهەڵگرانی "دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا!"، کەسێک بوو لەوانەی نەک دوورەپەرێز، بەڵکو بە گەرموگوڕی و شەوقەوە بە پیری تێگەکانی من لە بارەی سێکسەوە هاتبوو، هاتە لام و وتی: "تۆ، شایستەی هەموو پەسندانێکی. کارل مارکس ڕێگەی پێشانی خەڵکی دا چۆن لە دەست کۆیلەیەتیی ئابووری ڕزگاریان ببێت و سەربەستیی ئابووری بە دەست بهێنن و تۆیش ڕێگەت پێشانی خەڵکی داوە چۆن بتوانن سەربەستیی جنسی بە دەست بهێنن و پێت وتون: "برۆن چەندێ دەتوانن گان بکەن!"

لە سەری تۆدا تەنیا بێئابرووی و بێشەرمی جێیان دەبێتەوە. ئەوەی من بە لەئامێزگرتنی پڕ لە خۆشەویستی ناو دەبەم، لە پێش چاوی تۆدا دەبێت بە دیمەنێک لە گانکردنی گەند و پەلۆخ.

تۆ تێناگەیت لە بارەی چییەوە دەدوێم، هەر بۆیەیش تا بێت بەرەو بن و قووڵتر بە زەلکاوەکەدا ڕۆ دەچیت.

ژنی گرگن! ئەگەر بە ڕێکەوت و بێ ئەوەی هیچ زانیارییەکت لە دەستدا بێت، هەر لەبەر ئەوەی خۆت خاوەنی منداڵی خۆت نەبوویت، بووبیت بە مامۆستا، دەبیت بە مایەی زەرەر و زیانێکی گەورە. کاری تۆ ئەوەیە منداڵان پەروەردە بکەیت "بۆ ئەوەی بتوانرێت دروست و بە شێوەیەکی ڕێکوپێکیش پەرە بە سێکس بدرێت لە منداڵاندا، دەبێت ئەزموون و تاقیکردنەوە مرۆڤی فێر کردبێت خۆشەویستی چییە"، بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ لە بەرمیلێک دەچیت و ناشیرینیت و پێکهاتەی لەشت تەنیا ڕێی ڕەتکردنەوە و لەخۆدوورخستنەوەت پێ دەدات، لە ناخی دڵتەوە ڕقت لە هەموو

منداڵێکی ڕووگەش و لێوبەخەندە و زیندوو دەبێتەوە، ناتوانیت کارێکی وا ئەنجام بدەیت. بێگومان، لەبەر ئەوە گلەیی و سکاڵات لە دەست ناکەم، چونکە جوان و سەرنجڕاکێش نیت، یا لەبەر ئەوەی قەت بۆت نەلواوە خۆشەویستی بکەیت، "هیچ پیاوێکی تەندروست، ناتوانێت تۆی خۆش بووێت."، لەبەر ئەوەیش نا کە لەو خۆشەویستییە تێناگەیت کە لە منداڵاندا هەیە، ئەوەی بووە بە هەوێنی سکاڵا و گلەیی من لە دەست تۆ ئەمەیە: تۆ لەو ئێش و ئازارانەی بە دەستیانەوە ناڵاندووتە، لەو بارە ناقۆڵایەی لەشت، لەوەی بە دەست ناشیرینی و هیچلەباردانەبوونییەوە تلاویتەتەوە، لە بێتواناییت لە خۆشەویستیدا، لەو ڕق و کینەیەی لەش و گیانی تەنیویت، شاکارێک پێکدەهێنیت و خۆشەویستی منداڵانی پێ دەخنکێنیت کاتێک ڕێت پێ دەدرێت مینا مامۆستایەک لە فێرگەیەکی نوێدا هەڵسوکەوت بکەیت. ئەمە تاوان و ڕەتکردنەوە و بەرپەرچدانەوەیە، ژنکۆک! زەرەر و زیانی تۆ لەوەدایە کە ئەو منداڵە تەندروستانە دەکەیت بە دوژمنی خوێنەخۆری باوکە تەندروستەکانیان؛ لەوەدایە مینا نیشانەکانی دەرکەوتنی نەخۆشییەک لەگەڵ ئەو خۆشەویستییە تەندروست و پاک و بێگەردەدا هەڵسوکەت دەکەیت، ئەو خۆشەویستییەی سەراپای منداڵانی گرتۆتەوە. تۆ ئافرەتە ناحەز و ناقۆڵا گرگنەکە، تەنیا بەوەوە ناوەستیت لە بەرمیلێک بچیت، بەڵکو مینا بەرمیلێکیش بیر دەکەیتەوە و گۆش دەکەیت و پەروەردە دەکەیت. لەبریی ئەوەی هێمن و ئارام خۆت لە یەکێک لە قوژبنە بێدەنگەکانی ژیان بخزێنیت، هەموو هەوڵێک دەدەیت، هەرچییەک لە دەستت بێت درێخی ناکەیت، بۆ ئەوەی ژیان بە ناحەزییەکانت، بە ناقۆڵایی و ناجۆرییەکانت، بە فریودان و دەستبڕین و ڕق و کینەکانت؛ کە لە ژێر زەردەخەنەیەکی پڕ لە درۆدا پەنهانت داون، لەکەدار بکەیت.

تۆیش پیاوی بچووک! بەوەی کە ڕێ دەدەیت ئەو جۆرە ژنانە منداڵە تەندروست و پاک و بێگەردەکانت پەروەردە بکەن، ڕێ خۆش دەکەیت بۆ ئەوەی گیانە پاک و بێگەردەکەیان بە تاڵ و

سوێری و ژەهری ئەوان پیس ببێت. هەربۆیە ئەوەیت کە هەیت، بەو جۆرە بیر دەکەیتەوە کە دەیکەیتەوە و بەو جۆرە دەژیت و دنیاکەیشت بەو جۆرەیە کە هەیە.




*تەنیا بەوەوە ناوەستیت لە بەرمیلێک بچیت، بەڵکو مینا بەرمیلێکیش بیر دەکەیتەوە و گۆش دەکەیت و پەروەردە دەکەیت. لەبریی ئەوەی هێمن و ئارام خۆت لە یەکێک لە قوژبنە بێدەنگەکانی ژیان بخزێنیت، هەموو هەوڵێک دەدەیت، هەرچییەک لە دەستت بێت درێخی ناکەیت، بۆ ئەوەی ژیان بە ناحەزییەکانت، بە ناقۆڵایی و ناجۆرییەکانت، بە فریودان و دەستبڕین و ڕق و کینەکانت؛ کە لە ژێر زەردەخەنەیەکی پڕ لە درۆدا پەنهانت داون، لەکەدار بکەیت.*

هاتیت بۆ لام، بۆ ئەوەی ئەوە فێر ببیت کە بە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر و بە کارکردنێکی سەخت و گران بە دەستم هێناوە، ئەگەر من نەبوومایە، تۆ تا ئێستایش هەر پزیشکێکی گشتی نەناسراو و بێ ناووناوبانگ دەبوویت لە یەکێک لە شارە بچووکەکاندا. من گەورەییم پێ بەخشیت، توانست و زانیارییەکانی خۆم، ئەو شێوازەم پێدایت کە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکانت بە کاری دەهێنم. فێرم کردیت لەگەڵ تێپەڕبوونی هەر ساتێک، هەر ڕۆژێکدا، سەربەستی چۆن بە ناخدا ڕۆ دەچێت و تۆوی کۆیلەیەتیش چۆن تا دێت زیاتر گەشە دەکات و پەرە دەستێنێت. بەرپرسێتیی نوێنەرایەتیکردنی منت لە وڵاتێک لە وڵاتاندا لە ئەستۆ گرت. نیازپاکیی تۆ، جێی باوەڕ و متمانەی من بوو، بەڵام چونکە لە ناخەوە هەستت دەکرد بە چ ڕادەیەک وابەستەی منیت و بێ هالیکاری و دەستگیرۆیی من هیچ ئاکامێکی مژدەبەخش بە دەست ناهێنێت، نە توانیت هیچ لە خۆتدا بگۆریت و نە توانیت بە هیچ کلۆجێک ڕێ بۆ بەرەوپێشچوونی خۆت خۆش بکەیت. بۆ ئەوەی بتوانیت توانستە زانستییەکان هەڵمژیت، لە نرخ و بەهای خۆت تێ بگەیت و لایەنە تار و ڕووناکەکانی داهاتوو ببینیت، لەسەر هەر شتێکی تریشەوە بۆ ئەوەی بەرەوپێشچوون و گەیشتن بە پلەیەکی باڵاتر بە دەست بهێنیت، پێویستت بە هالیکاری و دەستگیرۆیی من هەبوو. هەموو ئەمانەیشم بە دڵخۆشی و شادییەوە پێ بەخشیت و هیچم لەبرییان نەویست، بەڵام دواتر ڕاتگەیاند کە "بە زۆر!" بۆ ئەو کارە هانم دابوویت. دەمپیس و دەغەزار و بێئابروو بوویت، لەو بڕوایەدا بوویت کە ئەم دەمپیسی و دەغەزارییەت دەتوانن "ئازاد"ت بکەن، بەڵام تێکەڵکردنی دەمپیسی و دەغەزاری بە ئازادی، هەمیشە، نیشانەیەک بووە بۆ ناسینەوەی کۆیلەکان. بە دەستڕاکێشان بۆ ئەوەی کە سەربەست و ئازادیت، بە نێوی ئەوەوە کە سەربەست بوویت و بە ئازادی کارەکەت ئەنجام دەدا، ئەوەت ڕەت کردەوە هیچ ڕاپۆرتێک لە بارەی چۆنێتیی بەڕێوەچوونی کارەکەتەوە بنووسیت. تۆ، تەنیا لە بارێکی وادا هەست بە "سەربەستی"ی خۆت دەکەیت. "سەربەست" لە نەگرتنە ئەستۆی بەرپرسێتی و

”سەربەست“ لە هالیکارینەکردندا. هەر لەبەر ئەوەیشە ئەوەیت کە هەیت و دنیاکەیشت ئەو دنیایەیە کە هەیە!

لەوە بەخەبەریت گرگن! کاتێک هەڵۆیەک لەسەر هێلکەی مریشک کڕ کەوتووە، هەست بە چی دەکات؟

هەڵۆکە، سەرەتا، لەو بڕوایەدایە کە دوای ترووکانی هێلکەکان چەند بەچکەهەڵۆیەک هەڵدێن، ئەویش، ئەو بەچکەهەڵۆیانە بە خێو دەکات تا لە دواییدا ببن بە هەڵۆی گەورە، بەڵام دوای ترووکانی هێلکەکان، بێجگە لە چەند جووجەڵەیەکی گردەڵۆکە زیاتر هیچی تر هەڵنایەت. هەڵۆکەیش، سەراسیمە و سەرگەردان، هەر بەو هیوایەوە کە ئەو جووجەڵانە لە کۆتاییدا هەر دەبن بە هەڵۆ، بەردەوام دەبێت. بەڵام نا! جووجەڵەکان گەورە دەبن و دەبن بە چەند مریشکێکی گارەگارکەر و کاتێک هەڵۆکە لەمە تێدەگات بە زۆر ڕێ لە خۆی دەگرێت کە ئەو جووجەڵە و مریشکە گارەگارکەرانە نەخوات. تەنیا شتێک کە ڕێی ئەم کارەی لێ دەگرێت ئەو نەختە هیوایەیە کە لەنێو ئەو جووجەڵە جووکەجووککەرانەدا هەڵۆیەکی بچووک هەیە و ڕۆژێک دێت ببێت بە هەڵۆیەکی گەورەی وەک خۆی، پتەو و توندوتۆڵ. هەڵۆیەک کە لە ترۆپکە بەرزەکانەوە بڕوانێت و دنیا نوێیەکان، بیرە نوێیەکان و شێوازە نوێیەکانی ژیان بە دی بکات و بدۆزێتەوە. تەنیا ئەم نەختە هیوایەیە ڕێ لەو هەڵۆ تەنیا و دڵتەنگ و خەمبارە دەگرێت کە گشت ئەو جووجەڵە و مریشکە گارەگارکەرانە بە پەڕ و گۆشت و ئێسکیانەوە هەڵلووشێت. مریشکەکان ئەوەیان نەدەبینی کە هەڵۆیەک لەسەریان کڕ کەوتووە، ئەوەیان نەدەبینی کە لەسەر تەوقەنەی تاوێرێکی تیژ و بەئاسمانداچوو، دوور لە دۆڵە تاریک و نووتەک و شێدارەکان، لە دایک بوون. دوور نەیاندەڕوانی، هەرچییەک ”ئەو“ بە دەستی دەهێنا بۆیان، چڵێسانە و بەوپەڕی چاوچنۆکییەوە ئاودیویان دەکرد و هەڵیاندەلووشی، کاتی باوبۆرانیش خۆیان لە ژێر باڵە بەهێز و گەرموگوڕەکانی ئەو دەخزان و بۆ خۆیشی دەبوو بەرگەی هەر باهۆز و زریانێک بگرێت، بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی هەبێت خۆی پێ بپارێزێت.

ئەگەر بارەکەیش لەوە خراپتر بووایە، بەو نیازەی بریندراری بکەن، بەردی تیژیان پێدا دەکرد، هەڵۆکەیش، کاتێک ئەم ناپەسەندی و بێئەمەکییەی ئەوانی بە دی دەکرد، سەرەتا دەیویست لەتوپەت و پارەپارەیان بکات، بەڵام دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر لەم کارەیان، بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە و بیری لەوە دەکردەوە و بەو هیوایە بوو کە لەنێو ئەم جووجەڵە چڵێس و نزیکبینانەدا هەڵۆیەکی بچووک، مینای خودی خۆی، هەیە و دەبێت هەبێت. ئەم هەڵۆ تەنیایە، تا ئەمڕۆیش دەستبەرداری ئەو هیوایەی خۆی نەبووە و هەر بەردەوامە لەسەر هەڵهێنانی جووجەڵە بچووکەکان.



*هەڵۆمریشکەکان!*

تۆ ناتەوێت ببیت بە هەڵۆیەک، گرگن! بۆیە سیسارکەکان دەتخۆن. لە هەڵۆکان دەترسیت، بۆیە لە ڕەو و گەلی گەورەدا دەژیت و هەر لەنێو ئەو گەل و ڕەوانەیشدا دەخورێیت. هەندێک لە مریشکەکانت لەسەر هێلکەی سیسارک کڕ کەوتوون؛ سیسارکەکانیش بوون بە ڕابەرت لە خەباتدا دژی هەڵۆکان؛ ئەو هەڵۆیانەی دەیانویست هەرێمە بەرفراوان و چاکترەکانت پێشان بدەن. سیسارکەکان فێریان کردیت بە لاشەی تۆپیو و کەلاشان ڕابێیت و بە چەند دەنکەگەنمێک ڕازی بیت و هاوار بکەیت: "بژی سیسارکی مەزن!" ئێستا لە برساندا ناڵەت دێت و بە جەڵەب دەمریت و هەر بەردەوامیشیت لە ترسان لە هەڵۆکان؛ ئەو هەڵۆیانەی لەسەر هێلکەی مریشکەکانت کڕ کەوتوون.

ماڵەکەت، ژیانت، فەرهەنگەکەت، شارستانییەکەت، زانست و شێوازەکانی کارکردنت، خۆشەویستی و پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانت، هەر هەموو ئەمانەت، لەسەر بناغەیەکی خۆنەگر و شلوشەوێق بونیاد ناوە. نە لەمە بەئاگایت و نە دەیشخوازیت لێی بە ئاگا بهێنرێیتەوە. ئەو پیاوە گەورەیەی لەمە بەئاگات دەهێنێتەوە، سووک و ئاسان، بە دەستی مەرگی دەسپێریت. زمانبەستراو و لاڵەپەتە، هەمیشە و بێبڕانەوە، بە هەمان پرسەوە دەگەڕێیتەوە: "منداڵەکەم هیچنەبیس و بزێوە، هەرچییەکی بەر دەست بکەوێت دەیشکێنێت، شەوان لە ترسان دەقیژێنێت، ناتوانیت ئەرکەکانی قوتابخانەی بە جێ بهێنێت، بە دەست قەبزییەوە ئازار دەچێژێت، زەرد و لاواز، هار و لاسار و شەڕانییە، چیم پێ دەکرێت، یارمەتیم بە!"

یا:

"ژنەکەم ساردوسڕە، خۆشەویستیم ناداتێ، ئازارم دەدات، کەللەیی دەبێت و مینا شێتوهارێک هەڵسوکەوت دەکات، دەستی لەگەڵ چەندان پیاوی تردا تێکەڵ کردووە. چیم پێ دەکرێت؟ ئامۆژگارییەکم بکە!"

یا:

“جەنگێکی نوێ هەڵگیرساوە، جەنگێکی نوێی توقێنەر، هەرچەندە ئێمە سەرکەوتووانە کۆتاییمان بە دواجەنگ هێنا. یارمەتی! چی بکەم؟“

یا:

“ئەو شارستانییەی کە جێی شانازی و مایەی سەربڵندییە، ئەو شارستانییەی شایستەی هەموو پێداهەڵدان و پەسندانێکە خەریکە بە دەست هەڵاوسانی ئابوورییەوە نغرۆ دەبێت و دادەتەپێت. ملیۆنان خەڵک هیچیان نییە بیخۆن، لە برساندا دەناڵێنن، دەکوژن، دەبڕن و دەدزن، بەرەو لەنێوچوون دەڕۆن و هیچ هیوایەکیان بە ژیان نەماوە. یارمەتیم بە! بڵێ چی بکەم، چیم پێ دەکرێت!؟“

“چی بکەم؟ دەتوانریت چی بکرێت؟“

ئەمانەن پرسە تاهەتایی و بێبڕانەوەکانت بە درێژاییی تەواوی چاخەکان! چارەنووسی هەموو شاکارە مەزنەکان، لەبەر ئەوەی زادە و لەدایکبووی جۆرە ژیانێکن تێیدا هەقیقەت بەر لە دڵنیایی و خۆپاراستن دانراوە، ئەوەیە کە بەوپەڕی پیسکەیی و چڵێسییەوە هەڵیانلووشیت و دواتر بیانکەیتە پێشاوەکانەوە.



*بەرگەی هیچ دەربڕین و بزاڤ و جووڵەیەکی سروشتی و سەربەست و زیندوو ناگریت.*

چەندان پیاوی تەنیا و بێهاودەمی گـەورە، لە دەمێکەوە، پێیان ڕاگەیاندویت کە دەتوانیت چی بکەیت. هەمیشە و بێبڕانەوە تێگە و دۆزەکانی ئەوانت بە هەڵە وەرگرتووە و بە هەڵەیش داونەتەوە و پـارە پـارەت کـردوون و تێکوپێکت داون. هەمیشە لـە لای نادروست و هەڵەوە دەستیان دەدەیتێ. لەبریی ڕاستییە دروست و بێگرێوگۆلەکان، هەڵە هیچوپووچ و بچووکەکانت کردووە بە ڕێپێشاندەری هەڵسوکەوت و کارەکانت لە ژیانتدا؛ چ لە ئایین، چ لە گەیاندن و بڵاوکردنەوەی سۆسیالیزم، چ لە مافی گەلان بۆ خۆبڕیاردانی چارەنووس، بگرە لە هەر شتێکی تردا کە فێری دەبیت، پیاوی بچووک!

“بۆ وا دەکەم؟“ تۆ دەپرسیت.

باوەڕ ناکەم بە ڕاستت بێت و نیازێکی پاکت لەم پرسەتدا هەبێت. کاتێک هەقیقەتت بەر گوێ دەکەوێت، هاوار دەکەیت: “پیاوکوژی نەفرەتلێکراو، یا بە خۆت دەبیت بە پیاوکوژ و دەکوژیت.“

ئەمانە هەموویانت کـردون و ماڵەکەیشت لەسەر بناغەیەکی خۆنەگر و شلوشەوێق بونیاد ناوە، چونکە دەترسیت و لە خۆت ڕانابینیت هەست بە شتە زیندووەکانی نێو خۆت بکەیت، چونکە خۆشەویستیی منداڵەکەت، تەنانەت بەر لە لەدایکبوونیشی، دەنێیتە ژێر پێ و دەیچەوسێنیتەوە و دەیمرێنیت، چونکە بەرگەی هیچ دەربـڕیـن و بـزاڤ و جووڵەیەکی سروشتی و سەربەست و زیندوو ناگریت. ئەمە لە ناخەوە دەتترسێنێت و دەپرسیت: “ئاخۆ هاوسێیەکانت و دۆست و برادەرەکانت چی بڵێن!؟“

دەترسیت بیر بکەیتەوە، چونکە بیرکردنەوەی ڕاست و دروست بە هەست و نەستەکانی لەشەوە بەندە و تۆیش لە لەشی خۆت دەترسیت، پیاوی بچووک!

چەندان پیاوی گەورە پێیان وتوویت: “بگەڕێرەوە بۆ بنەچە و ڕەچەڵەکی خۆت، گوێ بۆ دەنگی ناخت ڕادێرە، دوای هەست و نەستە

بێ گرێوگۆڵەکانت بکەوە، بە تەنگ گۆشکردن و پەروەردەکردنی ئەوینەوە بە.“ تۆ کەڕ بوویت و هیچ هەستێکت بەرانبەر ئەو پەیڤانە نەجووڵاوە. ئەم پەیڤانە لە بیابانە دوورەدەستەکاندا دەمرن و ئامۆژگاریکارە تەنیا و بێهاودەمەکانیشت لە بیابانە بێ سنوور و تۆقێنەرەکاندا دەسووتێنرێن، گرگن!

تۆ دەتتوانی لەگەڵ نیتشەدا لە نێوان هەڵکشان و بەرزبوونەوە بەرەو مرۆڤە گەورەکە و لە نێوان ڕۆچوون و سووکایەتیپێکردنی هێتلەر بە مرۆڤە باو و هەمیشە لەژێرەوەبووەکەدا هەڵبژێریت. ڤیژاندت بژی و مرۆڤە گرگن و هەمیشە لەژێرەوەبووەکەت هەڵبژارد.

دەتتوانی لە نێوان دەستوورە دروست و پیرۆزە دیمۆکراتییەکەی لینین و دیکتاتۆرییەکەی ستالیندا هەڵبژیریت. دیکتاتۆریەکەی ستالینت هەڵبژارد.

دەتتوانی لە نێوان ڕاژەکردنی فرۆید بۆ سێکس، مینا هۆی سەرەکی بۆ گشت نەخۆشییە هەستەکی و دەروونییەکانت و دۆزە و تێگەکانی ئەو لە بارەی خۆگونجاندنی فەرهەنگیدا هەڵبژێریت، دید و تێڕوانینەکانی ئەوت لە بارەی فەرهەنگەوە “کە هیچ زەمینەیەکت پێ نادات لەسەر ڕابوەستیت“ هەڵبژارد و دید و بۆچوونەکانی ئەوت لە بارەی سێکسەوە پشتگوێ خست.

دەتتوانی لە نێوان سادەییە پڕ لە شکۆییەکەی مەسیح و ئەو ڕەبەنییە تاهەتاییەی کە پاولۆس بە بەری قەشە و پیاوە ئایینییەکانیدا بڕی، یا بە تۆپزی ناچارکردنت بە ژیانی خێزانەوە هەڵبژێریت. بە لەبیرکردنی دایکە سادەکەی مەسیح؛ دایکێک کە تەنیا خۆشەویستی منداڵەکەی پێ هەڵگرتبوو، ڕەبەنییە تاهەتاییەکەی پاولۆس و ژیانی بەناچاریت لە خێزاندا هەڵبژارد.

دەتتوانی لە نێوان تێگەیشتنی مارکس بۆ هێزەکانی بەرهەمهێنان لە ژیانە زیندووەکەتدا کە تاقە بەرهەمهێنی زێدەبەهای نرخە و لە

نێوان دید و تێڕوانین و تێگەیشتنی ئەودا بۆ دەوڵەت هەڵبژێریت. ئەو ژیان و زیندوویێتییەت لە بیر کرد کە لە کارەکەتدا هەیە و دید و بۆچوونەکانی ئەوت لە بارەی دەوڵەتەوە هەڵبژارد.

لە کاتی شۆڕشی فەرەنسادا دەتتوانی لە نێوان ڕۆپسیێری زاڵم و بەد و دانتۆنی مەزندا هەڵبژێریت. بەدی و زاڵمیت هەڵبژارد و مەزنی و خەمخۆری و بەتەنگەوەهاتنت ڕەوانەی مەقسەڵە کرد.

لە ئەڵمانیا دەتتوانی لە نێوان یۆرین و هیملەر و لانداو و موهسان و لیبکنێختدا هەڵبژێریت. هیملەرت کرد بە بەڕێوەبەری پۆلیس و هاوڕێ مەزنەکانی خۆت کوشت.

دەتتوانی لە نێوان پۆلیۆس سریێشەر و واڵتەر ڕاتێناودا هەڵبژێریت. ڕاتێناوت کوشت.

دەتتوانی لە نێوان لۆدج و ویڵسۆندا هەڵبژێریت. ویڵسۆنت کوشت.

دەتتوانی لە نێوان ئەو یاسا و ڕێسایانەدا کە کڵێساکان دەرهەق بە لەڕێلادەران و نکوڵیکەرانەی سەروەری و دەستەڵاتی کڵێساکان دایاننابوون و لە نێوان ڕاستییەکانی گالیلەیۆدا هەڵبژێریت. گالیلەیۆی مەزت بە سووکایەتیپێکردن و ئەشکەنجە و ئازاردان بە دەستی مەرگ سپارد. تۆ کە تا ئێستایش لە دۆزینەوەکانی ئەو قازانجت دەست دەکەوێت، کەچی هەر ڕێگەخۆشکەری بۆ گەشەکردن و گەشانەوەی ئەو یاسا و ڕێسایانەی کڵێساکان دەرهەق بە نکوڵیکەران و لەڕێلادەران دایاننابوون.

دەتتوانی لە نێوان تێگەیشتن لە نەخۆشییە دەروونییەکان و چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییانەدا لە ڕێگەی تۆقاندن و ترساندنی نەخۆشەکانەوە هەڵبژێریت. ڕێگەی تۆقاندن و ترساندنی نەخۆشانت، مینا ڕێگاچارەیەک، گرتەبەر؛ چونکە نەتدەویست لە بەربڵاوی و زەبەلاحیی ئەو کڵۆڵییە تێ بگەیت کە بە دەستیەوە دەتلێیتەوە.

ئەمەیش بۆ ئەوەی هەر بە کوێری بمێنیتەوە، لە کاتێکدا تەنیا گەشبینی و چاوکراوەیی دەتوانێت بە هاناتەوە بێت و یارمەتیت بدات.

تازەکیش دەتتوانی لە نێوان وزەی ئەتۆمیی کۆتاییهێن بە ژیان و وزەی "ئۆرگۆن"ی یارمەتیدەردا هەڵبژێریت. ڕاستگۆ و بەئەمەک لەگەڵ ناقۆلایی و ناجۆریی بیرکردنەوەکانتدا، وزەی ئەتۆمیت هەڵبژارد.

ئێستایش دەتوانیت لە نێوان هیچنەزانین و بێتواناییدا لە بارەی خانەشێرپەنجەییەکان و ئاشکراکردنی نهێنییەکانی ئەو خانانەوە لە لایەن منەوە؛ "ئاشکراکردنێک کە دەتوانێت و دەبێت بە مایەی ڕزگارکردنی ژیانی ملیۆنان مرۆڤ لە دەست مەرگ"، هەڵبژێریت. چەندان ساڵی دوورودرێژە هەمان دەبەنگی و هیچلەباردانەبوویی لە ڕۆژنامەکانتدا بڵاو دەکەیتەوە، بەڵام تەنیا پەیڤێک چییە لە بارەی ئەو توان و زانستەوە بڵاو ناکەیتەوە کە دەتوانێت منداڵەکانت و ژنەکەت و دایکت لە چنگی مەرگ قوتار بکات.

تۆ هیندیی گرگن، ملیۆنانت لێ دەمـرن، ملیۆنانت لە برساندا دەناڵێنن، کەچی لە پێناوی پاراستنی مانگا پیرۆزەکانتدا، لە دژی موسڵمانەکان دەجەنگیت. تۆیش ئیتالیایی گرگن! کۆیلە گرگنەکەی تریستە!، پارە پارە و لەتوپەت دەکرێیت، کەچی هیچ خەمخۆرییەکی دیکەت نییە لەوە زیاتر کە ئاخۆ تریستە ئیتالیاییە یا سلاڤی! لە کاتێکدا من پێم وابوو کە تریستە تەنیا تابگەیەک بێت کەشتی و گەمییەکان لە هەموو کون و قوژبنێکی دنیاوە ڕووی تێ بکەن.

نازییەکان، دوای ئەوەی ملیۆنان مرۆڤیان کوشت، هەڵدەواسیت. لە کوێ بوویت و چۆن بیرت دەکردەوە بەر لەوەی ئەوان ببن بە مایەی لەنێوبردن و قڕکردنی ئەو ملیۆنان مرۆڤە؟ لەنێوبردن و قڕکردنی چەند کەسێک بەس نییە بۆ ئەوەی بکەویتە بیرکردنەوە؟ قڕکردن و لەنێوبردنی ملیۆنانت پێویستە بۆ ئەوەی هەستی مرۆڤانەت ببزوێت و بکەوێتە جـووڵان؟ هـەر یەکێک لـەم نزمی و سووکایەتییانە،

تیشکێکی تره و دەکەوێتە سەر ئەو کڵۆڵی و نەگبەتییەی مرۆڤایەتی بە دەستیەوە دەناڵێنێت. تۆ دەڵێیت: "بۆ ئەمانەت هێندە بە گرنگ گرتووە؟ خۆت بە بەرپرسی هەمووان دەزانیت؟ خۆت بە بەرپرسی هەموو ناجۆری و بەدکارییەکان دەزانیت؟"

کاتێک ئەمە دەڵێیت، خۆت خۆت تاوانبار دەکەیت. ئەگەر ئێوە؛ ئێوەی ملیۆنان لە پیاوی بچووک و بوودەڵە، تەنیا پچێک بە تەنگ ئەو بەرپرسێتییەوە بهاتنایە کە لە ئەستۆتاندا بوو، ئێستا دنیا لە بارێکی جیاوازتردا دەبوو، هاوڕێ گەورەکانیشت بەدەم ئازاری سووکی و هیچلەباردانەبوویی تۆوە گیانیان بە دەستی مەرگ نەدەسپارد.

ماڵەکەت تا ئێستایش هەر لەسەر بناغەیەکی خۆنەگر و شلوشەوێق ڕاوەستاوە و بانی ماڵەکەت بە سەرتدا دەتەپێت، کەچی هەر لە هەوڵی پاراستنی "ئابرووی کرێکارانە!" و "ئابرووی نەتەوەیی!"دایت. ئەرزەکەی ژێر پێت لە ژێرتدا خۆی ڕاناگرێت و دەتەپێت، کەچی بەردەوام و بێبڕانەوە دەقیژێنیت: "سەربەرزی و نەمری بۆ تۆ ڕابەری مەزن! سەربڵندی و نەمری بۆ ئابرووی ڕووسی، ئابرووی ئەڵمانیایی و ئابرووی یەهودی!"



*پیاوە سیاسی و دیپلۆماسییەکانت دەربەدەر بکە!*

بۆریی ئاوەکانت دەتەقێن و منداڵەکانت دەخنکێت، بەڵام تۆ هەر لەسەر پاراستنی "یاسا و ئاساییشی گشتی" بەردەوامیت؛ ئەو یاسا و زەبتوڕەبتەی کە دواتر بە شەق و تێهەڵدان منداڵەکانتی پێ گۆش و پەروەردە دەکەیت.

دیوارەکانت خۆ لەبەر بادا ڕاناگرن، ژنەکەت تووشی هەڵامسانی سییەکان بووە و لە پاڵەوە لێی کەوتووە، بەڵام تۆ پیاوی بچووک! هەر لەسەر ئەو بڕوایە بەردەوامیت کە ئەوەی دەبێت بە بناغەیەکی پتەو و خۆڕاگر بۆ بوونت، بریتییە لە "بیر و دۆزێکی یەهودی".

بە هەڵەداوان خۆت دەگەیەنیتە لای من و دەپرسیت: "دۆکتۆرە گەورە و گرانەکەم! چی بکەم؟ دەبێت پیاو چی بکات؟ ماڵەکەم دادەتەپێت، با لە دیوارەکانیەوە دێت، منداڵەکانم، ژنەکەم و خۆیشم نەخۆشین. چی بکەم؟ دەکرێت پیاو چی بکات؟"

ئەمە وەڵامەکەیە:

ماڵەکەت لە بەرد بینا بکە، مەبەستم لە بەرد سروشتی تایبەتی خۆتە، کە وەکو تر سەرت پێ نەوی کردووە و لە ژێر پێت ناوە، خۆشەویستیتە لە نزیکەوە بۆ منداڵەکانت، خەوبینینی ژنەکەتە بە خۆشەویستییەوە، ئەو خەونەیە لە تافی لاوێتیدا بە ژیانەوە بینیوتە. خەیاڵات و هیوا دوورە نەشیاوەکانت، بە پچەک لە ڕاستی بگۆڕەرەوە. ڕابەرە سیاسی و دیپلۆماسییەکانت ڕەوانەی دۆزەخ بکە. چارەنووسی خۆت بگرە دەست خۆت و ژیانت لەسەر بناغەیەکی پتەو و خۆڕاگر بینا بکە. هاوسێیەکانت لە بیر بکە و گوێ بۆ دەنگی ناوەوەی خۆت ڕادێرە. هاوسێیەکانت بەم کارەت خەنی دەبن و سوپاست دەکەن. بە هاوڕێ کرێکارەکانت، لە سەرانسەری دنیادا، ڕابگەیەنە کە لەمەودوا تەنیا بۆ ژیان کار دەکەیت، نەک بۆ مردن. لەبریی ئەوەی بە هەڕاکردن خۆ بگەیەنیتە ئەو جێیانەی جەللادەکانت یاساکانیان تێیاندا جێبەجێ دەکەن و بکەویتە هاتوهاوار و چەپڵەلێدان و ئافەرینکردنیان، یاسایەک بۆ پارێزگاریکردن لە ژیانی مرۆڤایەتی بخوڵقێنە و بیپارێزە. یاسایەکی وا دەبێت بە بەردێک لە بەردەکانی ئەو بناغەیەی ماڵەکەتی لەسەر بینا دەنرێت. خۆشەویستیی منداڵە وردیلەکانت لە چنگ هەڵمەتی ژن و پیاوە چڵێس و قەت

ڕەحەتنەبووەکان بپارێزە. ئەو خاما قسەهێن و قسەبەرە دەمەوەرە بە دەست بهێنە کە لاوان لە خشتە دەبات، پەردە لەسەر ناپەسەندی و ناجۆریی هەڵسوکەوتەکانی هەڵبماڵە، یا لە یەکێک لەو جێگایانەی بۆ چارەکردنی نەخۆشییە دەروونییەکان دروستت کردون توندی بکە، لەبریی ئەوەی ئازار و ئەشکەنجەی لاوان بدەیت کە تەنیا بە دوای بەدەستهێنانی خۆشەویستیدا دەگەڕێن. هەوڵ مەدە بەسەر خونخواری و زۆرداریـی خوێنمژەکانتدا ئاودیو بیت و کاتێک دەستەڵاتێکت دەکەوێتە دەست، ببیت بە خوێنمژێکی لەوان خوێنمژتر. پاڵتاوە شلوشۆڕە داکەوتووەکەت و تەپلە قووتەکەت فڕێ بدە و داوای مۆڵەت مەکە بۆ ئەوەی بتوانیت ژنەکەت لە ئامێز بگریت. پێوەندی بە خەڵکانی ترەوە، لە هەر کوێیەک هەن، ببەستە، چونکە ئەوانیش بە هەموو باشە و خراپەکانیانەوە کەسانێکن مینا خودی خۆت. ڕێ بدە منداڵەکانت چۆن سروشت، یا خوا!، خوڵقاندوونی، گەشە بکەن و گەورە ببن. هەوڵ مەدە سروشت چاکتر بکەیت، لەبریی ئەوە هەوڵ بدە لێی تێ بگەیت و بیپارێزیت. لەبریی ئەوەی بچیت بۆ سەیرکردنی یارییەکی کۆڵەمستانێ، یا دیدەنیکردنی شوێنی ڕابواردن و کاتبەسەربردن، بچۆ بۆ کتێبخانەیەک، بۆ وڵاتە دوورەکان گەشت بکە.



*جێی کاتبەسەربردن و ڕابواردن!*

بێجگە لەمانەیش:

ڕاست و دروست بیر بکەرەوە، گوێ بۆ دەنگی ناخت ڕادێرە؛ ئەو دەنگەی وریایانە پێت ڕادەگەیەنێت کە دەبێت چی بکرێت. ژیانی خۆت لەنێو دەستەکانتدایە، بە کەسی تری مەسپێرە و کەسی دی مەکە جێمتمانەی پاراستن و بەتەنگەوەهاتنی ـ بەتایبەت ڕابەرە هەڵبژێردراوەکانت. خۆت بە! چەندان پیاوی گەورە ئەمەیان پێ وتوویت!

تۆ دەڵێیت: "گوێ بگرن، لەم هەڵگەڕاوەیە لە شۆڕش، گوێ بگرن، لەم بۆرژوا بچووکە خۆپەسەند و تاکڕەوە!" هیچ شتێک لە بارەی ڕەوتی ڕاست و دروستی مێژووەوە نازانێت. دەڵێیت: "خۆت بناسە، خۆت بە!" چ قسەیەکی هیچ و بێمانای بۆرژوایانەیە ئەمە! کرێکارانی شۆڕشگێڕی دنیا بە ڕابەریی پێشەوا خۆشەویستەکانی، بە ڕابەریی باوکی هەموو گەلان؛ باوکی هەموو ڕووسەکان، سلاڤێکان و ئەڵمانیاییەکان گەلان و نەتەوەکانی دنیا ڕزگار دەکات! بمرن خۆپەسەند و تاکڕەوەکان! بمرن ئەنارکیستەکان!"

نەمری و سەربەرزی بۆ هەموو گەلە سلاڤێکان و باوکە پێشڕەوەکەی پیاوی بچووک!

گوێ بگرە گرگن! من پێشبینی ئەو بارە ناهەموار و سەختە دەکەم کە ڕووبەڕووی بوویتەتەوە: تۆ لەسەر ڕێی سەندنی دەستەڵاتدایت لە دنیادا. ئەمە دەزانیت و هەر ئەمەیشە وای لێ کردوویت هەموو گیان و لەشت وەک بی ناو ئاو بلەرزێت. چەندان چاخی تریش دەبیت بە مایەی کوشتنی هاوڕێیەکانت و هاوکات مینا سەروەرەکانت بە ڕابەرانی گشت گەلاندا هەڵدەڵێیت. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، شەو لە دوای شەو، هەفتە لە دوای هەفتە و مانگ لە دوای مانگ و بەردەوام و بێبڕانەوە بە شانوشکۆی یەک لە دوای یەکی ڕابەرەکانتدا هەڵدەڵێیت. هاوکاتیش نە گریانی منداڵەکانت دێتە بەر گوێت، نە کڵۆڵی و بەدبەختیی لاوان دەبینیت، نە تاسە و ئارەزووی پیاوان و

ژنان بۆ ژیان سەرنجت ڕادەکێشێت. ئەگەر بەر گوێیشت بکەون، ئەگەر بێنە پێش چاوت و سەرنجیشت ڕابکێشن، بە خۆپەسندان و تاکڕەوان، بە ڕێهەڵگرانی دیدوبۆچوونی تاکەکەسی، ناودێریان دەکەیت. بە درێژایی چاخەکانی بەردەمت لە جێیەکدا کە تێیدا دەتوانرا ژیان بپارێزرێت، لەسەر خوێنڕشتن بەردەوام دەبیت و وا بڕوا دەهێنیت کە بە یارمەتی و هالیکاریی جەللادەکانت توانیوتە ئازادی و سەربەستی بخولقێنیت، هەمیشەیش هەر لە هەمان کلۆڵیدا کە لە بوونتەوە بە دەستیەوە دەناڵێنیت، خۆت دەبینیتەوە.

بە درێژایی چاخەکانی بەردەمت، ملهوڕ و هیچلەباردانەبوو، دەکەویتە دوای خۆهەڵکێش و فشەکەران و پەیڤ و وتەکانیان دەپارێزیت، لە بەردەم گفت و بەڵێنەکانیاندا دێیتە سەر چۆکان و ملنەوی دەکەیت، بەڵام کاتێک ژیان؛ ژیانی خۆت، بانگت دەکات؛ کوتوکوێر و کەڕ و هیچنەبیس و دەستەوەستان دەمێنیتەوە، چونکە تۆ لە ژیانی زیندوو دەترسیت و تۆقیویت لێی گرگن!

بەو بڕوایەوە کە گوایا "سۆسیالیزم" بینا دەکەیت، یا "ئابرووی نەتەوەیی" و "دەوڵەت" دەپارێزیت، یا "پیرۆزیی خوا" و "پەیمان و ڕێککەوتنەکانی نێوان کرێکاران و خاوەنکاران" دەپارێزیت، ژیانی خۆت بە دەستی مەرگ دەسپێریت، بەڵام شتێک هەیە نە دەیزانیت و نە دەیشخوازیت بیزانیت و ئەویش ئەمەیە کە لەڕاستیدا ئەو تاکە شتەی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، سات لە دوای سات، بینای دەکەیت؛ ئەو کلۆڵییەی بە دەستیەوە گیرۆدە بوویت، ئەوەیە کە لە منداڵەکانت تێ ناگەیت، تەنانەت بەر لەوەی هیچ هەلێکیان بۆ ڕەخسابێت تا بڕوابەخۆکردن و متمانەیان پەرە پێ بدەن، سەر بەو متمانە و بڕوابەخۆکردنەیان نەوی دەکەیت. خۆشەویستی دەدزیت، چاوچنۆک و چڵێس بۆ بەدەستهێنانی دەستەڵات شێت و هار بوویت. هەر بۆ ئەوەی پێشان بدەیت کە دەستەڵاتت بەسەر کەسێک، یا شتێکدا، دەشکێت، سەگ ڕادەگریت!

بە درێژاییی چاخەکانی بەردەمت هەمان هەڵە دووپات دەکەیتەوە

تا ئەودەمەی خۆت و گشت وێکچووەکانت لە ئاکامی ئەو کلۆڵییە کۆمەڵایەتییە سەرانسەرییەی تێی کەوتوویت لە نێو دەچن و دەمرن؛ مردنێکی بێشومار و بەکۆمەڵ، تا ئەو دەمەی ترسی بە یەکجاری لەبەینچوون و فەوتانت، پچێک ئاگادارت دەکاتەوە و هۆشت دەهێنێتەوە بەر خۆت، دواتر، بەرە بەرە و گاڤ بە گاڤ، خۆت فێر دەکەیت، بە دوای هاوڕێکانتدا بگەڕێیت؛ ئەو هاوڕێیانەی بەرهەمی ئەوین و کارکردن و توانستی زانستین، خۆت فێر دەکەیت چۆن دۆستایەتییان بە دەست بهێنیت، لێیان تێ بگەیت، ڕێزیان لێ بگریت و نرخی خۆیان پێ بدەیت؛ خۆت فێر دەکەیت و لەوە تێ دەگەیت کە کتێبخانەیەک بۆ ژیانت گرنگترە لە چوونە دیدەنی یارییەکی کۆڵەمستانێ؛ خۆت فێر دەکەیت کە پیاسەی نێو دارستانێک چاکترە لە پێداهەڵدان و پەسندانی ڕەوت و نمایشە سوپاییەکان، خۆت فێر دەکەیت متمانەبەخۆکردن چاکترە لە متمانەکردن بە نەتەوە؛ خۆت فێر دەکەیت کە چارەسەرکردن لە کوشتن چاکترە، کەمداواکردن چاکترە لە پێداهەڵدانی نیشتمانپەروەری و هەر غەڵبەغەڵب و ساغڵەمەیەکی دیکەی لەو چەشنە.



*لە ژیان دەترسیت.*

تۆ لەو بڕوایەدایت ئامانجەکان ئەو کەرەستانە پیرۆز دەکەن کە بۆ گەیشتن پێیان بە کار دەهێنرێن، تەنانەت ناپەسەندترین و ناحەزترینیشیان. هەڵەیت. ئامانجەکان کتومت ڕەنگ و بۆ و سیمای ئەو ڕێگایانە وەردەگرن کە بۆ گەیشتن پێیان دەیانگریتە بەر. هەموو هەنگاوێک لە ئەمڕۆدا، ژیانی سبەینێتە. هیچ ئامانجێکی پیرۆز بە بەکارهێنانی کەرەستەی ناجۆر و ناقۆلا بە دەست ناهێنرێت. ئەمەت لە هەموو شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکانتدا سەلماندووە. گرتنەبەری ناحەزی و کاری نابەجێ و نائینسانییەت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان ناحەز و دەغەزار و نائینسانت دەکەن و بە ئامانجەکانیشت ناگەیەنن.

گوێم لێتە دەپرسیت: "ئەدی چۆن بە ئامانجەکانم دەگەم، چۆن دەگەمێ ئەوینی ئایینی و سۆسیالیزم و دیمۆکراتییەتی ئەمەریکایی بە دەست بهێنم!؟" ئەوینی ئایینی و سۆسیالیزم و دیمۆکراتییەتی ئەمەریکایی ئەو کارانەن ڕۆژانە دەیانکەیت، ئەو شتانەن سات لە دوای سات بیریان لێ دەکەیتەوە، لەئامێزگرتن و ڕامووسانی هاوڕێی ژیانتە، خۆشەویستی و ئەوینتە بۆ منداڵەکانت، ئەو بەرپرسییە کۆمەڵایەتییەیە کە لە هەمبەر کارەکەتدا هەتە، خۆلادان و دوورەپەرێزیتە لەوەی ببیت بە یەکێک لە خونخوارەکانی ژیانت.

ئەو ئازادی و سەربەستییەی بەهۆی دامودەستگا و دەستوورە دیمۆکراتییەکانەوە بە دەستت هێناون، خراپ بە کاریان دەهێنیت. لەبریی ئەوەی ڕێ بدەیت ئەو دامودەستگا و دەستوورە دیمۆکراتییانە لە قووڵایی ژیانی ڕۆژانەتدا ڕەگ دابکوتن، قڵپیان دەکەیتەوە.

مینا پەناهێنێکی ئەڵمانیایی بینیمیت، بینیمیت چۆن بە هەڵە دڵاوایی و میوانداریێتیی سویدییەکانت بە کار دەهێنا، ئەوسا، خۆت بە ڕابەرێکی ئایینەدیی هەموو گەلانی زۆرلێکراو و چەوساوەی ئەم دنیایە ناودێر کردبوو. ئەو مێزانەت دێتەوە یاد کە سویدییەکان بە خواردنی هەمەچەشنە ڕازاندبوویانەوە و لە پێش ئێمە دایاننابوون!؟

بێگومان دیتەوە یادت؟ دەزانیت مەبەستم چییە! خۆ ناکرێت هەروا سووک و ئاسان لە یادت کردبێت!؟

کەواتە با بە یادت بهێنمەوە:

سویدییەکان دابونەریتێکی تایبەتیان هەیە لەوەدا کە مێزی ڕازاوە بە خواردنی بەتام و هەمەچەشنە بۆ میوانەکانیان دەڕازێننەوە و لە بەردەمیان دادەنێن، ئیتر دەکەوێتە سەر میوانەکان چی بۆ خواردن هەڵدەگرن و چەندیان پێ دەخورێت. ئەم دابونەریتە، ئەم ڕێوڕەسمە، تازە و نامۆ بوو بە تۆ. نەتدەتوانی لەوە تێ بگەیت مرۆڤ چۆن دەتوانێت متمانە بە دڵاوایی و دەستئاوەڵایی مرۆڤانی دی بکات. بە خۆشی و شادییەکەوە کە تەنیا مایەی بەدبەختی و خەمینیی کەسانی ترە بۆت گێڕامەوە کە چۆن بە درێژایی ڕۆژ هیچت نەخواردووە بۆ ئەوەی ئێوارەکەی ورگی خۆت بە خواردنی خۆڕایی و مفت بئاخنیت.

"ئاخر بە منداڵی برسی بووم!" تۆ واتوت.

دەزانم گرگن، چونکە پێشتر بە برسێتی بینوومیت، دەزانم برسێتی چییە، بەڵام تۆ؛ ئەی ڕزگارکەری ئاییندەیی خەڵکی لە دەست کۆیلەیەتی و برسێتی، نازانیت بەوەی کە خواردن دەدزیت، لە داهاتوودا، ملیۆنان جار پتر برسێتی بە باڵای منداڵەکانتدا دەبڕیت. هەندێک شت هەیە مرۆڤ نایکات، کاتێک بە دڵاوابییەوە میوانداریێتی دەکرێت، نە کەوچکی زیو دەدزێت و نە هەوڵی فریودان و لەخشتەبردنی ژنی خانەخۆییەکەی دەدات. بێ لەوەیش، پیاو لەو مێزی نانخواردنەوەی بەوپەڕی سەربەستییەوە لە بەردەمیدا دانراوە، نادزێت. دوای ئەو بەڵایەی بەسەر ئەڵمانیادا هات، لە برساندا نیوەمردوو، لە یەکێک لە باخچە گشتییەکاندا، ڕووبەڕووی یەکتر بووینەوە. ئەوەت بۆ گێڕامەوە کە "یارمەتیی سوور!؛ ڕێکخراوی پارتییەکەت بۆ دەستگیرۆیی و یارمەتیدان و دژایەتیکردنی هەر کڵۆڵییەک کە لە دنیادا هەیە"، نەیویستووە یارمەتیت بدات، چونکە پێشتر ناسنامەی ئەندامێتیی پارتییەکەتت

ون کردووە و نەتتوانیوە ئەندامێتیت لەو پارتییەدا بسەلمێنێت. ڕابەرەکانت؛ ڕابەرانی گشت برسییەکانی دنیا، جیاوازی لە نێوان مرۆڤی سوور و مرۆڤی سپی و مرۆڤە ڕەشە برسییەکاندا دەکەن. لە کاتێکدا ئێمە تاکە یەک زیندەی برسی دەناسین، ئەو زیندەیەی برسێتی بە باڵا و لەشتدا بڕیوە.



*پاسەوانی سەرسنوور.*

لەگەڵ گرفت و کێشە بچووکەکاندا بە هەمان شێوەی پرس و کێشە گەورەکان هەڵسوکەوت دەکەیت.

دەتەوێت کۆتایی بە قۆناغی چەوساندنەوەی سەرمایەداری بهێنیت، نەفرەت لە ڕێزنەگرتن و بەسووکسەیرکردنی ژیانی مرۆڤایەتی بکەیت، دەتەوێت دان بە دروستی و ڕەوایی مافەکانتدا بنرێت. بەر لە چاخێک لەمەوبەریش، چەوساندنەوە و بیرنەکردنەوە و ڕق و کینە بەرانبەر ژیان هەر هەبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ڕێزگرتن لە کارە بەجێ و سوودبەخشەکان و متمانەکردن و پێزانین و بەئەمەکیش بەرانبەر بەو کەسانە هەبوون کە کاری گرنگ و مژدەبەخشیان بە ئەنجام گەیاندووە. ئەمڕۆ، کە لە دەوروبەرەکەی خۆم ورد دەبمەوە و دەڕوانم، دەبینم خەریکی کارکردنی پیاوی

بچووک! لە هەر شوێنێک ڕابەرەکانت دابنێیت، هەر جێگایەکیان پێ ببەخشیت، چەوساندنەوە و بەکارهێنانی کارەکەت زیاتر و زیاتر دەبێت؛ ڕق و کینە بەرانبەر بە ژیانت ناحەزتر و ناقۆڵاتر دەبێت، داننان بە مافە ڕەواکانیشتدا بە تەواوی شوێنەون بووە.

چەند زیاتر هەوڵ بدەیت و بجەنگیت بۆ ئەوەی جێوڕێ بۆ ڕابەرەکانت خۆش بکەیت، هێندە زیاتر ڕێزگرتن لە کارە سوودبەخش و بەجێیەکانت لە دەست دەدەیت. لەبریی ئەوە دەست دەبەیت و بەروبوومی دەستی هاوڕێیەکانت، کە بە کارکردن و خەریکبوونێکی سەخت و گران بە دەستیان هێناوە، دەدزیت.

تۆ نازانیت دانپێدانان بە کارامەیی و متمانەپێکردنی چی دەگەیەنێت، چونکە لەو بڕوایەدایت ئەگەر دان بە دروستی و ڕاستیی کارێکدا بنێیت و ڕێزی لێ بگریت، ئەوە لە دەست دەدیت چیی تر ئەمەریکاییەک، ڕووسێک، یا چینییەکی ئازاد و سەربەست بیت.

ئەوەی دەتویست تێکوپێکی بدەیت و دوایی پێ بهێنیت، ئێستا لە هەر کاتێکی تر چاکتر لە نەشونما و گەشەکردندایە، ئەوەیش کە دەتویست بە هەر نرخێک بێت بە دەستی بهێنیت، ئەگەر پاراستنی ژیانیشت بخوازێت، تێکوپێکت داوە و شێواندووتە. تۆ پێت وایە، متمانەکردن خەسڵەتی "ناسکبوونی هەست" یا خوونەریتێکی "بۆرژوا بچووکەکان"ە. ڕێزگرتن لە کاری بەکەڵک و سوودبەخشیش، هاتنە سەر چۆک و گاگۆڵکێکردنە. هەست بەوە ناکەیت، لە کاتێکدا کە دەبوو لەسەر هەموو شتێک بهاتیتایەتە دەنگ، هاتوویتە سەر چۆک و گاگۆڵکێ دەکەیت. هەست بەوە ناکەیت، لە کاتێکدا کە دەبوو پێزان و بەئەمەک بیت، سپڵە و پێنەزانیت.

بەراوەژوو دەبینیت و لەو بڕوایەیشدایت ئەم دیتنە بە زێدی سەربەستی و ئازادیت دەگەیەنێت. ئەودەمە دێت، لەم خەوە قورسە ڕاپەڕیت و ببینیت چۆن بێئومێد و لەپەوڕوو لێی کەوتوویت، بێ

ئەوەی کەسێک بە هاناتەوە بێت، چونکە تۆ لەوەی دەبەخشرێت دەدزیت و دەیبەخشیتە دز. مافی بەئازادیدەربڕین و پەیڤین و ڕەخنەگرتنت، گۆڕیوەتەوە بە قسەی بێسەروبەر و گاڵتەوگەپی گەلۆرانە. دەخوازیت ڕەخنە بگریت، بەڵام ناتەوێت ڕەخنەت لێ بگیرێت. هەر بەم هۆیەیشە لەبەریەکهەڵوەشاویت. دەتەوێت هەڵمەت ببەیت، بێ ئەوەی خۆت ڕووبەڕووی هەڵمەتێک ببیتەوە. هەر بۆیەیش هەمیشە لە پشتەوە دەکوژێیت.

"پۆلیس! پۆلیس! سەیری پاسپۆرتەکەی بکەن، بزانن ئاخۆ ساختەیە یا نا؟ بزانن ئاخۆ لەڕاستیدا پزیشکە یا نا؟ ئەگەر پزیشکە ئەی بۆ ناوی لە هیچ شوێنێکدا تۆمار نەکراوە؟ بۆ یەکێتیی پزیشکان دژایەتیی دەکات؟"

پۆلیسەکانت ناتوانن یارمەتیت بدەن، گرگن! ئەوان دەتوانن دزەکان بگرن، کاروباری ڕێکوپێککردنی هاتوچۆ بە ڕێوە ببەن، بەڵام نە دەتوانن سەربەستیت بۆ بە دەست بهێنن و نە دەیشتوانن بیپارێزن. تۆ خۆت سەربەستیی خۆتت شێواندووە، بە هەنگاوی گورج و بەپەلە و بێبەزییانەیش هەر بەردەوامیت لە تێکدان و شێواندنیدا. بەر لە "جەنگی یەکەمی جیهانگر" هیچ جۆرە پاسپۆرتێک نەبوو، بۆ هەر لایەک بتخواستایە دەتتوانی گەشت بکەیت. جەنگەکەت بۆ بەدەستهێنانی "ئاشتی و ئازادی" پاسەوانانی سنوورەکانی دروست کرد، بەو کارەیش هەموو دەرگاکانت بە ڕووی خۆتدا کڵۆم کرد. دوای "جەنگی دووەمی جیهانگر"یش؛ ئەو جەنگەی کە کۆتایی بە "هەموو جەنگەکان!" هێنا، بۆ ئەوەی بتتوانیایە چەند فرسەخێک بە ئەوروپادا گەشت بکەیت و مۆڵەت بۆ ئەو گەشتەت وەربگریت، ناچار بوویت بەوەی سەر بە قونسوڵیەتی دەیان وڵاتاندا بکەیت. ئێستایش هەر بە هەمان شێوەیە و لە داهاتوویشدا دوای هەموو جەنگە یەک لە دوای یەکەکانت؛ ئەو جەنگانەی کۆتایی بە "گشت جەنگەکان!" دەهێنن، هەروا دەمێنیتەوە.


ئەڤین دژ بە یاسایە،
تەنیا ڕێ بە ...
دەدرێت.

“گوێ بگرن! سووکایەتی بە ویست و خواستنی بەرگریکردنم دەکات، بە خراپە لە بارەی کەرامەتی نیشتمان و ئابرووی نەتەوەوە دەدوێت!“

بێدەنگ بە پیاوی بچووک! هەر هەموو ژیانت کڵۆڵییە. هیچ هیوایەکم نییە بتوانم لەو کڵۆڵییە ڕزگار بکەم، ئەگەرچی بە تەپلە و دەمامک و بە پەتێکی نێو دەستە بەد و ناحەزەکانیشتەوە بێیت بۆ خنکاندم، بەڵام تا دوایی بەم وتەیە نەهێنم دەست هەڵناگرم. ناتوانیت هەڵمبواسیت، پیاوی بچووک! ئەگەر هاوکات و لەگەڵ مندا خۆیشت هەڵنەواسیت، چونکە من نوێنەرایەتیی ژیانت، بەتەنگەوەهاتنت بۆ دنیا، نوێنەرایەتیی مرۆڤایەتییەکەت، ئەوین و توانای داهێنان و خووڵقاندنەکەت دەکەم. نا، ناتوانیت بمکوژیت، گرگن! جارێک لە جاران لێت دەترسام، کتومت وەک ئەوەی جارێک لە جاران گەلێک هیوای گەورە و گرانم پێت هەبوو، بەڵام ئیتر لەودەمەوەی بەرەو بەرزایی هەڵکشاوم و لە نزمییت دوور کەوتوومەتەوە، نە لێت دەترسم و نە هیچ هیوایەکم بە ڕزگارکردنت هەیە. ئێستایش، لە ڕوانگەی هەزاران ساڵی ڕابوردووەوە، لە ڕوانگەی هەزاران ساڵی داهاتووەوە، دەتبینم. دەمەوێت ئیتر لە خۆت نەترسیت، دەمەوێت بژیت، ژیانێکی هەمیشەیی و بەختیار. دەمەوێت، لەبریی لەشێکی ڕەقوتەق و وشکهەڵاتوو، لەشێکی زیندووی پڕ لە ژیانت هەبێت. دەمەوێت، لەبریی ئەوەی ڕقت لە منداڵەکانت بێت، خۆشت بووێن. دەمەوێت، ژنەکەت شاد و بەختیار بکەیت و ژیانی “ژن و مێردایەتی“ نەکەیت بە کەرەستەی داپڵۆسین و ئازاردانی. من پزیشکی تۆم. هەر لەبەر ئەوەیش کە تۆ لە سەرانسەری ئەم گلۆڤەرەدا دەژیت، پزیشکی سەرپاکی دنیاکەتم. نە ئەڵمانیاییم، نە جوولەکە، نە دیان، نە ئیتالیایی و دانیشتوویەکی ئەم گلۆڤەرەم و هاودنیاتم، بەڵام بۆ تۆ تەنیا فریشتە ئەمەریکاییەکان و شەیتانە یابانییەکان هەن.

“ڕێی لێ بگرن! لێی بکۆڵنەوە ئاخۆ مۆڵەتی دراوەتێ وەک پزیشکێک کار بکات؟ فەرمانێکی شاهانە دەر بکەن، کە بەبێ ڕەزامەندیی

شای وڵاتە سەربەست و ئازادەکەمان، ناتوانیت مینا پزیشکێک کار بکات! ئەو لە بەکاری و بێکەڵکیی حەز و ئارەزووکانم دەکۆڵێتەوە! بیخەنە زیندانەوە! لە وڵات دەرینێن!“

خۆم ئەو مافەم بە خۆم داوە لە کارەکەمدا بەردەوام بم و کەسێکی تر ناتوانێت ئەو مافەم پێ ببەخشێت. زانستییەکی نوێم بونیاد ناوە، زانستییەک کە لە ئاکامدا مرۆڤ لەڕێی سوودوەرگرتن و بەکارهێنانیەوە دەتوانێت لە ژیانی تۆ تێ بگات. کتومت چۆن بە درێژاییی چاخەکانی ڕابوردوو، بۆ ئەوەی دەستەڵات لە دەست نەدەیت و بیپارێزیت، چڵێسانە، هەموو دەستکەوتە زانستییەکانی زانایانی ترت هەڵلووشیوە، لە داهاتوویەکی نزیک یا دووردا، هەمان کار لەگەڵ دەستکەوتە زانستییەکانی منیشدا دەکەیت. وەزیری کاروبارە کۆمەڵایەتییەکانت هیچ دەستەڵاتێکی بەسەر مندا نییە، گرگن! ئەو تەنیا کاتێک دەیتوانی، چ بە چاک چ بە خراپ، خۆی لە کارەکەم هەڵقورتاندایە، یا دەستی بەسەر کارەکەمدا بشکایە، ئەگەر ئەو بوێرییەی تێدا بووایە ڕاستییە زانستییەکەی منی بخوێندایە و لێی تێ بگەیشتایە، بەڵام ئەو هێندە بوێر و ئازا نییە، هەربۆیە لە وڵاتەکەی خۆیدا بانگەشەی ئەوە دەکات کە گوایا من لە یەکێک لە دینگە ئەمەریکاییەکان توندکراوم، هاوکاتیش گەلۆرێکی کردووە بە پشکنەری نەخۆشخانەکانی وڵاتەکەی، گەلۆرێک کە پێی وایە دەتوانێت بە یارمەتیی ”تاقیکردنەوەی ناڕاست و ساختە“ دۆزی ”تامەزرۆیی بۆ ژیان“ بە درۆ بخاتەوە و دژایەتیی بکات.

هیچ کام لەمانە نابن بە ڕێگر لە پێش نووسینی ئەم وتەیەدا بۆ تۆ، گرگن!

بەڵگەی زیاترت دەوێت بۆ ئەوەی بێدەسەڵاتی و بێتواناییی ”دەستەڵاتی دامودەستگاکانت“ بسەلمێنیت؟

پسپۆرەکانت، ئەو دامودەستگایانەی بۆ چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە کۆمەڵایەتییەکانت دروست کردوون، ناتوانن ڕێ لە ڕاژەکردنێکی

تایبەت بۆ دیاریکردنی نیشانەکانی نەخۆشیی "شێرپەنجە"کەت بگرن و قەدەغەی بکەن. ڕێکورەوان دژی هەموو ئاستەنگ و ڕێلێگرتن و قەدەغەکردنێکی ئەوان، لەسەر خوێندن و شیکردنەوەی و تێگەیشتن لە لایەنە ڕووناک و تاریکەکانی نەخۆشییەکەت، بە یارمەتیی وردبین، لە بەئەنجامگەیاندنی کارەکەمدا بەردەوام بووم. هاوکات، ئەوان بە هەموو لایەکدا کەوتنە پەلهاویشتن و پەلەقاژێ، تەواوی وڵاتانیان تەی کرد، تەنیا بۆ ئەوەی بەر لە بەئەنجامگەیاندنی کارەکەم بگرن و لە نێوی ببەن، بەڵام بێسوود بوو. وەک هەر کاتێکی تر، لەو جێیەدا کە تێیدا چەقیبوون، هەر بە لێکۆڵینەوە لەو گۆڕانکارییانەوە خەریک بوون کە لە ئاکامی نەخۆشییەوە تووشی خانە زیندووەکان دەبن، بەڵام من زۆرجاران ژیانی تۆم ڕزگار کردووە، پیاوی بچووک!



*توێژینەوە لە نەخۆشیی شێرپەنجە.*

“كە ڕابەرایەتیی کرێکاران، لە ئەڵمانیا، دەستەڵات بە دەست دەهێنێت، ناچاری دەکەین مل بۆ بڕیارەکانمان نەوی بکات و بێتە ژێر بار! خووی لاوەکرێکارەکانمان تێکدەدات! پێی وایە، کرێکارانیش، مینا بۆرژواکان، لە توانایاندا نییە خۆشەویستی بکەن! ڕێکخراوەکانی لاوانی کردووە بە جێڕاوگەی پەڵۆخی و بڵاوکردنەوەی ئاکاری خراپ و شێوێنەر! پێی وایە من گیانەوەرم، نەک مرۆڤ! هۆشیاریی چینایەتیم دەشێوێنێت!“

ئا، پیاوی بچووک! ئەوانە دەشێوێنم کە کردووتن بە بت و دەیانپەرستیت، ئەو بتانەی نەک بە تەنیا وریایی و زیرەکی لە بەین بردوویت، بەڵکو سەریشیان خواستوویت. دەتەوێت هیوا زیندووەکانت تەنیا لە ئاوێنەدا ببینیت، بۆ ئەوەی نەتوانیت بە دەستیان بهێنیت. تەنیا کاتێک دەتوانیت ببیت بە گەورەی ئەم دنیایە و سەروەری بە دەست بهێنیت، کە هەقیقەتت بە دەست هێنابێت.

“وڵاتبەدەری بکەن! ژیانی لێ بکەن بە دۆزەخ! تەکووزی و یاساکان لە گۆڕ دەنێت! سیخوڕی دوژمنە خونخوارەکەمە! بە پارە و پوولی مۆسکۆ، یا بەرلین!، خانوویەکی کڕیوە!“

تۆ تێناگەیت گرگن!

پیرەژنێکی بچووک هەبوو لە مشک دەترسا، لەوە دەترسا مشکەکان خۆیان بکەن بە ژێر کراسەکەیدا و بە قاچوقوولیدا هەڵبگەڕێن. ئەگەر جارێک لە جاران، بیتوانیایە تاموچێژی خۆشەویستی بکات، قەت ئەم ترسەی نەدەبوو. ئەم پیرەژنە هاوسێی من بوو، دەیزانی کە مشکم لە ژێرخانەکەمدا هەیە. من لە ڕێگەی تاقیکردنەوەوە لەسەر ئەو مشکانە، خۆم فێر کرد چۆن لە بۆگەنی و توانای تێکدەرانەی “شێرپەنجە“کەت تێ بگەم، گرگن! تۆیش؛ پیاوە گرگنە بەستەزمانەکە، ڕێکەوت وا بوو جێگری خانەخوێیەکەم بیت و ئەم پیرەژنە بەستەزمانە گزگلە ناچاری کردیت لە خانووەکەم دەرم بنێیت. پڕچەک بە ڕەوشت و ئاکارە باوەکانی نێو کۆمەڵەکەت،

بۆ پارێزگاریکردن لە پیرۆزیی بتەکانی تەندروستبوونت، لە ماڵەکە بەدەرتنام. منیش، بۆ ئەوەی دوور لە نزمی و نەوێری و هیچلەباردانبوویی تۆ، بەڵام لە پێناوی تۆدا، لەسەر توێژینەوە و تاقیکردنەوەکانم بەردەوام بم، ناچار بووم خانوویەک بکڕم.

دوای ئەمە چیت کرد، پیاوی بچووک!

وەک دادوەرێکی گشتی کە بەدەستهێنان و پچڕاندنی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی تەنیا ئاواتێکە لە ژیاندا هەیبێت، هەوڵتدا بۆ گەیشتن بەو ئاواتەت "ئەو پیاوە خەتەرناکە" بە کار بهێنیت. هاتیت و تاوانی سیخوڕی بۆ ڕووسیا، یا ئەڵمانیات، بۆ هەڵبەستم. کارەکەت ئەوەی دەهێنا کە بۆت کرد، چونکە دواتر لە دادگادا بینیمیت چۆن گوێیەکانت لە شەرمەزاریدا سوور هەڵگەڕابوون. ئەوکات، "خزمەتکارە بچکۆلەکەی دەوڵەت"، بەزەییم پێتدا دەهاتەوە، چونکە تۆ جێی هەموو بەزەییپێداهاتنەوەیەکی. کاتێکیش، سیخوڕە نهێنییەکانت، بە هیوای بەدەستهێنانی "کەلوپەلی جاسووسی" ماڵەکەمیان پشکنی، هەر هێندەیان بۆ مایەوە چەند قسەیەکی سارد و سووکت، لە پاداشتی ئەو کارەی پێتسپاردبوون، بۆ ڕەوانە بکەن. دواتر، وەک دادوەرێکی جوولەکەی گرگن لە برۆنکس پێکگەیشتینەوە، دادوەرێک کە هێشتا هەر لە هەوڵی بەدەستهێنانی پلەوپایەدا بوو، بەڵام داهاتوویەکی نادیار چاوەڕێی دەکرد. بەوە تاوانبارت کردم و بە دادگات سپاردمەوە کە گوایا لە کتێبخانەکەمدا کتێبەکانی لینین و ترۆتسکی هەبوون. تۆ؛ پیاوە لیقەوماوە گرگنەکە، نازانیت کتێبخانەیەک بۆچی بە کار دەهێنرێت. پێم وتیت: "لە کتێبخانەکەمدا، کتێبەکانی هیتلەر، بودا، مەسیح، گۆتە، ناپلیۆن و کازانۆڤایش هەن." تێمگەیاندیت مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت لە تاعونی هەست و نەستەکان بکات، دەبێت لە هەموو ڕوانگەکانەوە، نەک تەنیا لە ڕوانگەیەکی دیاریکراوەوە، لێی بڕوانێت. لە گشت تێڕوانین و دید و بۆچوونەکان بکۆڵێتەوە و یەک لایەنە نەکۆڵێتەوە. ئەمە شتێکی نوێ بوو بۆ تۆ، پیاوی بچووک!

“بیگرن، بیخەنە زیندانەوە! فاشییە! ڕقی لە خەڵکە!”

تۆ “خەڵک” نیت، دادوەرە پووتەکە! “تۆ”یت ڕقت لە خەڵکە، نەک من، چونکە تۆ هیچ گرنگییەک بە بەڕێوەبردنی مافەکانیان نادەیت، تەنیا پلەوپایەی خۆتت لا گرنگە. ئەمەت بەر گوێ کەوتووە و چەندان پیاوی گەورە پێیان ڕاگەیاندوویت، بەڵام دەزانم تۆ پیاوی گەورە ناخوێنیتەوە. من، بە ڕێزەوە لە “خەڵک” دەڕوانم، چونکە کاتێک کە هەقیقەتیان پێ ڕادەگەیەنم، خۆم دووچاری مەترسییەکی گەورە دەکەم. لەبریی ئەمە، دەمتوانی لەگەڵ تۆدا یاریی کاغەز بکەم یا گاڵتەوگەپی بێمانا و هیچوپووچ لەسەر خەڵک بگێڕمەوە، بەڵام ڕێ بە خۆم نادەم لەگەڵ تۆدا لەسەر هەمان مێز کۆ ببمەوە، چونکە تۆ پارێزگارێکی خراپیت بۆ بەرگریکردن لە ماف و ئازادییە ئەمەریکاییەکان.

“ترۆتسکییە! بیخەنە زیندانەوە! بووە بە مایەی پشێوی و ئاژاوەنانەوە بۆ خەڵک! ئەم سەگە سوورە!”

خۆت هێمن بکەرەوە، گرگن! من پشێوی و ئاژاوە بۆ “خەڵک” نانێمەوە، بەڵکو هەوڵ دەدەم هۆش و هزرەکانت، کار و کردەوەکانت، ڕاوەشێنم. تۆ، خۆت لەبەر ئەم کارەدا ڕاناگریت، چونکە لە پلوپای بەدەستهێنانی پلەوپایەدایت، یا خەریکی کۆکردنەوەی دەنگیت تا ببیت بە دادوەری دادوەرەکان، یا ڕابەری کرێکارانی دنیا. هەوڵ و تەقەلای تۆ بۆ سەقامگیربوونی داد و یەکسانی و بۆ بەدەستهێنانی ڕابەرایەتی، ئەو پەتەیە کە لە ملی مرۆڤایەتی ئاڵێنراوە. چیت لەگەڵ ودرۆ ویڵسۆن؛ ئەو مرۆڤە دڵگەرمەدا کرد؟ بە لای تۆوە؛ ئەی دادوەرەکەی برۆنکس، ویڵسۆن “ئایدیالییەکی شێتوویت” بوو، بە لای تۆیشەوە؛ ئەی ڕابەرە ئاییندەییەکەی کرێکارانی دنیا، ئەو “خوێنخۆری خەڵک!” بوو. ئەو پیاوەت، بە قسە بێماناکانت، بە بەتەنگەوەنەهاتن و بە ترسوبیمت لە ڕزگاربوون، کوشت.

تۆ منیشت لە مەرگ نزیک خستەوە، پیاوی بچووک!

تاقیگەکەمەت بە بیر دێتەوە، بەر لە چەند ساڵێک لەمەوبەر؟ ئەوکات، وەک یاریدەدەرێکی تەکنیکی لە تاقیگەکەمدا کارت دەکرد، لەبەر ئەوەی بێکار بوویت و سۆسیالیستێکی چاپووک و ئەندامی پارتییەک بوویت کە لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا بەشدار بوو، کەسێکی نزیک داوای لێ کردم ڕێت بدەم وەک یاریدەدەرێک لە تاقیگەکەمدا کار بکەیت. مووچەیەکی باش و سەربەستییەکی تەواوت هەبوو. لەبەر ئەوەی بڕوام بە خۆت و بە "پەیامەکەت" هەبوو، بۆ هەموو جڤینێک لەگەڵ خۆمدا دەمبردیت. دێتەوە بیرت لە پاداشتی ئەو ڕێزگرن و بەپیرەوەهاتنەدا، چی ڕووی دا؟ ئەو سەربەستییەی پێت ڕەوا بینرابوو، شێتی کردبوویت. چەندین ڕۆژ بینمیت چۆن قلیانەکەت بە لالێوتەوە نابوو، بێ ئەوەی هیچ کارێک لە ئەستۆ بگریت، کارت بەسەر دەبرد. لەوە تێنەدەگەیشتم بۆ کارت نەدەکرد. بەیانیان، کاتێک دەهاتمە تاقیگەکە، تەنیا بە مەبەستی ڕقهەستاندن، چاوەڕێی ئەوە بوویت "من" لە پێشەوە سڵاوت لێ بکەم. من حەز دەکەم لە پێشدا سڵاو لە خەڵک بکەم، گرگن!، بەڵام کاتێک کەسێک بە نیازی خۆسەپاندن چاوەڕێی ئەوە لە من بکات، تووڕە دەبم. بە دیتنی تۆ، من لە تۆ "گەورەتر" و "بەڕێوەبەر"ت بووم. ڕێم پێ دایت، چەند ڕۆژێکی تریش ئەو سەربەستییەت، ناشییانە، بە کار بهێنیت و دواتر قسەم لەگەڵدا کردیت. چاو پڕ لە فرمێسک، دانت بەوەدا نا کە نەتزانیوە ئەو سەربەستییەی لە کارەکەتدا پێت ڕەوا بینراوە، چۆن بە کار بهێنیت. بە سەربەستی نائاشنا بوویت. تۆ؛ ئەی ڕابەرە ئاییندەییەکەی کرێکارانی دنیا، لە جێکارەکەی پێشووتدا، نەک هیچ سەربەستییەکت نەبووبوو، بەڵکو تەنانەت نەتتوانیبوو لە پێش چاوی بەڕێوەبەرەکەتدا جگەرەیش بکێشیت، بێجگە لەوەیش، تەنیا کاتێک ڕێت پێ درابوو قسە بکەیت، کە پرسیارێک لێ کرابێت، بەڵام لە تاقیگەکەی مندا، چونکە سەربەستییەکی ڕاستەقینەت هەبوو، ڕقهەڵسێنانە و زووهەڵچوو هەڵسوکەوتت دەکرد. کاتێک لێت تێگەیشتم، لە کارەکە دەرمنەکردیت. دواتر، خۆت دەستت لە کارەکەت کێشایەوە و لە بارەی تاقیکردنەوەکانی منیشەوە بۆ دەروونناسی یەکێک لە دادگاکان دوابوویت. بێ لەوەیش،

یەکێک بوویت لەو کەسە فریودەر و زانیارییپێدەرە نهێنییانەی کە ڕۆژنامەکانت، چ لە خۆم و چ لە کارەکەم، تیژ کرد؛ بۆ ئەوەی بە هەموو شێوەیەک بەرەنگاری دەستکەوتە زانیارییەکانم ببنەوە.

تۆ ئاوایت کاتێک بۆت هەڵدەکەوێت تاموچێژە لە سەربەستی ببینیت، پیاوی بچووک!

بەڵام بە پێچەوانەی مەرامەکانی تۆوە، ئەو هەڵوێستەت و دەستدرێژی و بەدوکەوتنی تۆ و هەوڵدانت بۆ تێکدانی کارەکەم، نەک ناچاری نەکردم بە دەستکێشانەوە، بەڵکو کارەکەمی گەلێک لە کاتی چاوەڕوانکراو زووتر بە ئەنجام گەیاند.

ماڵاواییت لێ دەکەم، گرگن! چیی تر بیر لەوە ناکەمەوە خزمەتی تۆ بکەم. کاتێک بە تەنگ تۆوە دێم، ڕێ بەوە نادەم لە بەرەوە بەدەم ئازارەوە بمکوژیت. تۆ ناتوانیت لەو ڕێگا ئاوەڵا و بەرفراوانەی گرتوومەتە بەر، جێی پێم هەڵبگریت. ئەگەر پچێک ئاگادار بوویتایە لەوەی کە لە داهاتوودا چی چاوەڕێت دەکات، لە حەژمەتاندا دەتۆقایت، چونکە بێ هیچ گومان و دوودڵییەک، لەسەر ڕێی بەدەستهێنانی دەستەڵاتدایت لە دنیادا. نوێنەرە تەنیا و دەگمەنەکانی من، بەشێکن لە داهاتووی تۆ. لە ئێستادا ناخوازم هاوڕێی ئەم گەشتەم بیت. وەک هاوڕێی گەشت، تەنیا بۆ ئەوە باشیت پێکەوە ڕوو لە مەیخانەیەک بکەین، نەک ئەو جێیەی نیازمە بیگەمێ.

"بیکوژن! سووکایەتی بەو شارستانییە دەکات، کە من "منی بۆرەپیاو" بونیادم ناوە. من، مرۆڤێکی سەربەستی نێو دیمۆکراتییەکی سەربەستم. بژی!"

تۆ هیچ نیت، گرگن! تۆ ئەم شارستانیەت بونیاد نەناوە. ئەم شارستانییە ئاکامی هەوڵ و تەقەلای چەند کەسانێکی لێزان و بەئەمەکی نێو کۆمەڵەکەتە. تۆ کاتێک بینا دەکەیت، نازانیت چی بینا دەکەیت. کاتێک من یا هەر کەسێکی تر پێی وتیت: "بەرپرسیی

ئەم بیناکردنە لە ئەستۆ بگرە.“ مینا ”خائنی پرۆلیتاریا!“ گاڵتە و سووکایەتیت پێ کردین، هاوکاتیش بە پەلەپرووسکێ و هەڵەداوان هانات بۆ ”باوکی کرێکارانی دنیا!“ برد، ئەو باوکەی قەت ئەم شتانەت پێ ناڵێت.

تۆ سەربەست نیت، پیاوی بچووک! هیچ شتێک لە بارەی سەربەستییەوە نازانیت. ناتەوێت لەوە بەئاگا بیت مرۆڤ لە سەربەستیدا چۆن دەژی. کێ بوو چاوەقوڵکەی هەست و نەستەکانی لە ئەوروپادا گەیاندە دەستەڵات؟ تۆ بوویت، گرگن! لە ئەمەریکایش؟ بیر لە ویلسۆن بکەرەوە.

”گوێ بگرن! من؛ منی بۆرەپیاوە، تاوانبار دەکات! من چیم، چ دەستەڵاتێکم هەیە، تا بتوانم ڕێ لە سەرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان بگرم؟ من ئەرکی خۆم لە ئەستۆ گرتووە و گوێڕایەڵی بەجێهێنانی فەرمانم. هیچ شتێکیش لە سیاسەت تێ ناگەم!“

کاتێک ژیانی هەزاران پیاو و ژن و منداڵ بە ژووری گازەکان دەسپێریت، ئەوە دەکەیت کە پێت ڕاگەیەنراوە، وا نییە گرگن؟ هێندە بێگوناهیت، کە نازانیت ئەو ڕووداوانە بۆ ڕوو دەدەن! ئەمەش هەر درۆ و بوختانە، گرگن؟ تۆ کلۆڵێکی بەستەزمانیت، کلۆڵێک کە شتێکی بۆ وتن نییە، کلۆڵێک کە خۆی دید و تێڕوانینی خۆی نییە. بەهەمەحاڵ، تۆ کێیت تا لە سیاسەت تێ بگەیت؟ دەزانم، ئەمەم هێندە بەر گوێ کەوتووە، بەس بێت. بەڵام دەپرسم: ”کاتێک مرۆڤێکی زانا پێت ڕادەگەیەنێت کە خۆت بەرپرسیاری لە بەردەم ئەو هەڵسوکەوت و مامەڵانەدا کە دەیانکەیت.“ بۆ بێدەنگ و ئارام ئەرکەکانی سەرشانت بە جێ ناهێنیت، یا کاتێک هەوڵ دەدات وات لێ بکات چیی تر لە منداڵەکانت نەدەیت، یا کاتێک بۆ هەزارەمین جار دەڵێتەوە کە دوای ئەم یا ئەو ”دیکتاتۆر“ نەکەویت! ئەی ئەو کاتانە، ئەرکەکانی سەرشانت و گوێڕایەڵییە بێگوناهەکەت، لە کوێن؟



*ژەنەڕاڵەکەت لە جێیەکی بەرزتر لە خۆت دادەنێیت، بۆ ئەوەی بتوانیت ڕێزی لێ بگریت.*

نا، گرگن! تۆ گوێ بۆ هەقیقەت ناگریت. تۆ تەنیا گوێ لە کەسێک دەگریت هەراوزەنا و غەڵبەغەڵبت بۆ بنێتەوە، تا بتوانیت لەسەر هاتوهاوار و پێداهەڵدان و لەسەر چەپڵەلێدانی خۆت بەردەوام بیت.

تۆ بەد و نەوێریت، پیاوی بچووک!

هیچ شتێک لە ئەرکە ڕاستەقینەکانی سەرشانت تێ ناگەیت، ئەو ئەرکانەی یاریدەت دەدەن وەک مرۆڤێک هەڵسوکەوت بکەیت، ئەو ئەرکانەی یاریدەت دەدەن مرۆڤایەتی بپارێزیت و بەرگری

لە هاومرۆڤییت بکەیت. تۆ زۆر چاک لاسایی چەتە و ڕێگران دەکەیتەوە و زۆر خراپیش هی حەکیم و زانایان. فیلمەکانت، بەرنامەکانی ڕادیۆت، پڕن لە کوشتن و بڕین.

تۆ، ناتوانیت دەست لە کارە بەد و هیچوپووچەکانت هەڵبگریت. بە درێژاییی چاخەکانی بەردەمت لەسەر پیادەکردنیان بەردەوام دەبیت، تا ئەوەدەمەی بە یەکجارەکی دەبیت بە سەروەری خۆت. منیش بۆ ئـەوەی بتوانم خزمەتی داهـاتـووت بکەم، لە ئێستادا ماڵاواییم لە خۆت کـردووە، چونکە کاتێک لێتەوە دوورم زیاتر ڕێز لە کارەکەم دەگریت و ناتوانیت لە ناوم ببەیت. تۆ، ڕقت لە هەر کەسێک و لە هەر شتێکە لێتەوە نزیک بێت! هەربۆیە ژەنەڕاڵە کرێکارەکەت و سوپاسالاری جەنگەکانت، دوور و بەرزتر لە خۆت ڕاگرتووە تا بتوانیت بێ ئەوەی سەرزەنشتی هیچ کارێکی بکەیت، یا هیچ ڕەخنەیەک لە کار و کردەوەکانی بگریت، ڕێزی بگریت و بیپەرستیت؛ لە کاتێکدا شایستەی هەموو ڕق و کینەیەکە. هەر لەبەر ئەوەشە پیاوە گەورەکان، هەر لە بوولێڵەی مێژووەوە تا ئەمڕۆ، دوور لە تۆ و کار و کردەوەکانت خۆیان ڕاگرتووە.



*مرۆڤی باو.*

“بەدەستخستنی مەزنی شێتی کردووە، شێت بووە، شێت!“

دەزانم زۆر خێرایت، کاتێک هەقیقەت لەگەڵت ناگونجێت، مۆرکی شێتی بە سیمای خەڵکیدا بنێیت. خۆت “ئاسایی و باو“ دەبینیت، بۆیە شێتوویێتەکانت لە زیندانەکان توند کردووە و ڕێت داوە باو و ئاساییەکان دنیاکەت بە ڕێوە ببەن.

دەکرێت مرۆڤ کێ بە ئەم هەموو کڵۆڵی و نەگبەتییە تاوانبار بکات!؟ بێگومان تۆ نا! چونکە تۆ تەنیا ئەرکەکانی سەرشانت جێبەجێ دەکەیت و هیچی تر. تۆ کێیت تا دید و تێڕوانینی خۆتت هەبێت؟ دەزانم و پێویست ناکات ئەمە دووبارە بکەیتەوە.

تۆ نیت منت شپرزە کردووە، بەڵام کاتێک بیر لە منداڵە تازەلەدایکبووەکانت دەکەمەوە، کاتێک بیر لەوە دەکەمەوە چۆن ئازار و ئەشکەنجەیان دەدەیت تا ببن بە مرۆڤی خۆتئاسایی و لەو بتەمرۆڤانە بچن کە دەیانپەرستیت، دەمەوێت بۆ ئەوەی ڕێ لە تاوانەکانت بگرم، بگەڕێمەوە بۆ لات. دەزانم کە تۆ بۆ پاراستنی خۆت لەم تاوانانە وەزارەتێکت بە ناوی وەزارەتی چاودێریکردنی منداڵان و پەروەردە و فێرکردنیانەوە دروست کردووە.

خۆزگە دەمتوانی لەگەڵ خۆمدا بۆ گەشتێک بەم دنیایەدا دەمبردیت، پیاوی بچووک! تا ئەوەم پێشان بدایتایە کە ئێستایش و لەمەوبەریش، مینا “ڕچەشکێنێکی ئایینی، یا نوێنەری ویست و خواستەکانی خەڵکی“، چۆن بوویت و چیت ئەنجام داوە. هەر ئەوەندە بوێریت سەیرێکی خۆت بکەیت لە هەموو شوێنێک خۆت دەدۆزیتەوە، گرنگ نییە فرەنساییەک، ئەڵمانیاییەک، یا ئەندامی خێڵێک بیت لە خێڵە بچووکەکانی خوارووی ئەفریقا.

“سووکایەتی بە نامووس و ئابرووم دەکات! خۆزیا و ئاواتەکانم و ئەو ئەرکانەی لە ئەستۆمن پیس دەکات!“

نە گاڵتە بە ئابرووت دەکەم و نە ئەو بەرپرسییەی لە ئەستۆیشتە

لەکەدار دەکـەم، گرگن! زۆر شاد و بەختەوەر دەبـووم ئەگەر بتتوانیایە نادروستیی ئەم وتەیەم بسەلمێنیت، بیسەلمێنیت کە لە توانـاتدا هەیە بە تەنگ خۆتەوە بێیت و دان بەوەدا بنێیت چۆن و لە چ بارێکدا دەژیت. چۆن بەنایەک ناچارە گفتی ئەوە بدات ئەو خانووەی بینای دەکات دەبێت تۆکمە و توندوتۆڵ بێت و بۆ ژیان دەست بدات، تۆیش گفتی ئەوە بدەیت کە لە تواناتدا هەیە بەو جۆرە بینا بکەیت. ئەگەر ئەوە دەستتنیشان بکەم کە بەنایەک لەبریی بیناکردنی خانوویەکی تۆکمەوتۆڵ و لایەق بە ژیان، تەنیا لە بارەی چۆنێتیی بیناکردنەوە دەپەیڤێت، ئەوا ئەو بەنایە هیچ هەقێکی نییە بەوە گوناهبارم بکات کە سووکایەتی و گاڵتەم پێ کردووە. بە هەمان شێوەیش، دەبێت بیسەلمێنیت کە تۆ هەڵگرێکی بەئەمەکی داهاتووی مرۆڤایەتیت. ئیتر ناتوانیت وەک ترسنۆکێک لە پشت پەردەی پاراستنی "ئابرووی نەتەوە!" و پاراستنی "ئابرووی کرێکارانەوە!" خۆت حەشار بدەیت، چونکە بەشێکی زۆرت لە خۆت ئاشکرا کردووە و دەستەکەت خستووەتە ڕوو، گرگن!

ماڵاواییت لێ دەکەم. ماڵاواییەک کە چەندان شەوی پڕ ئازار و بێخەوی لێ خواستووم. ڕابەرە داهاتووییەکانی کرێکاران، ژیانت هێندەی من لێ ئاڵۆز ناکەن. ئەوان ئەمڕۆ ڕابەرانی تۆن و سبەینێیش دەبن بە چەند نووسەرێکی هیچلەباردانەبووی ناو ڕۆژنامە زەرد و هەرزانەکان و خەڵکی چۆن کراسەکانیان دەگۆڕن، ئەوانیش بیروڕاکانیان دەگۆڕن.

من، بیروڕای خۆم ناگۆڕم وەک ئەوەی کراسێکی پیس بێت. من، لەسەر بەتەنگەوەهاتن و گرنگیدان بە تۆ و بەو چارەنووسەی چاوەڕێت دەکات، بـەردەوام دەبم، بەڵام کاتێک لە تواناتدا نییە ڕێز لە کەسێک بگریت کە لێتەوە نزیکە، ناچارم خۆم دوور لە تۆ ڕابگرم. وەچەکانی داهاتووت، دەبن بە میراتگری کارەکەم و منیش هیچ لارییەکم لەوە نییە چاوەڕێی ئـەوان بم تا تاموچێژ لە بەروبوومی کارەکەم وەربگرن، چۆن بە درێژاییی سی ساڵی ڕەبەق چاوەڕێی تۆ بووم کارەکەم قەبووڵ بکەیت و بە کاری

بهێنیت. تۆ، لە هاتوهاوار و فاکوفیکی خۆت نەکەوتیت و دەستت لەوە هەڵنەگرت بقیژێنیت: "بڕۆخێت سەرمایەداری!" یا "بڕوخێت یاسا و دەستووورە ئەمەریکاییەکان!".



*بەڵام کاتێک بیر لە منداڵە تازەلەدایکبووەکانت دەکەمەوە، کاتێک بیر لەوە دەکەمەوە چۆن ئازار و ئەشکەنجەیان دەدەیت تا ببن بە مرۆڤی خۆتئاسایی و لەو بتەمرۆڤانە بچن کە دەیانپەرستیت، دەمەوێت بۆ ئەوەی ڕێ لە تاوانەکانت بگرم، بگەڕێمەوە بۆ لات.*

گوێ بگرە پیاوی بچووک! دەمەوێت دیمەنێک لە تۆ پیشان بدەم. ڕامەکە! دیتنی خۆش نییە، بەڵام بەسوودە و تۆقێنەر نییە! بەر لە چاخێک خۆت فێر کرد لاسایی زاناکانی فیزیک و ئەندازیارەکان بکەیتەوە و وتت: "ڕۆح نییە." و نکوڵییت لە بوونی کرد. دواتر، پیاوێکی گەورە، هەرچەند بەو پێوەندییەی نێون "ڕۆح" و "لەش"ت

نائاشنا بوو، توانی "ڕۆح"ت، "دەروون"ت پێشان بدات. تۆ وتت: "قسەی هیچ! شیکردنەوەی دەروونی یانی چی! مرۆڤ دەتوانێت میز شی بکاتەوە، بەڵام دەروون نا! خۆخەریککردن بە تەندروستی و دۆزینەوەی چارەسەر بۆ نەخۆشییەکان، بەبێ ئەوەی هیچ خوێندنێک یا زانیارییەکت لە بارەی تەندروستبوون و کاری پزیشکییەوە هەبێت! کەڵکی هیچ ناگرێت." ئەمەت وت، چونکە تەنیا شتێک لە بارەی دەرمانسازییەوە دەتزانی شیکردنەوەی میز بوو. خەبات لە پێناوی "ڕۆح"ی تۆدا چل ساڵی ڕەبەقی خایاندا. لەو خەباتە ئاگادارم، چونکە بۆ تۆ و لەبریی تۆ تێیدا بەشدار بووم. ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆت دەرکەوت کە پیاو دەتوانێت دەستکەوتێکی باش لە دەروونی مرۆڤێکی نەخۆش بە دەست بهێنێت و بۆ ئەوەیش تەنیا ئەوەندە پێویستە نەخۆشێک ناچار بکەیت کە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، ڕۆژانە چەند ساتێک بۆ دۆزینەوەی چارەیەک، بێت بۆ دیدەنیت و لەبریی هەر ساتێکش لەو ساتانە، بڕەپارەیەک بدات.

تەنیا ئەوکات، کە ڕۆح بوو بە کەرەستەیەک بۆ دەستکەوت، باوەڕت بە هەبوونی هێنا. هاوکاتیش توێژینەوە لەسەر لەشە نازیندووەکەت بەردەوام بوو. ئەوەم بۆ بۆ دەرکەوت کە "ڕۆح"ی تۆ بەرهەمی وز و تواناتە بۆ ژیان. بە واتایەکی تر: لەش و ڕۆح دوو بەشی پێکهێنەرن لە یەکەیەک. پاشان، جێپێی ئەم دۆزینەوەیەم هەڵگرت و بۆم دەرکەوت، کاتێک هەست بە بەختیاری دەکەیت، کاتێک هەست دەکەیت خۆش دەویسترێیت، وزە و توانای ژیان بەرفراوان و ئاوەڵا دەبێت، کاتێکیش دەترسیت، ئەم وزە و توانای ژیانە گرژ دەبێت و دەچێتەوە یەک. بە درێژایی پانزە ساڵی ڕەبەق، بە بێدەنگبوونت، دۆزینەوەکانمت کوشت، بەڵام من هەر لەسەر هەمان ڕێگا بەردەوام بووم و بۆم دەرکەوت کە ئەم وزە و توانای ژیانە، کە ناوم لێ ناوە "ئۆرگۆن"، لە دەرەوەی لەشی تۆدا، لە گەردوونیشدا، هەیە و کە تاریک دادەهات دەمتوانی لەڕێی ئامێرێکی تایبەتەوە کە بۆ ئەو نیازە دروستم کردبوو، ببینم. ئامێرێک کە دەیتوانی بەهۆی ڕاکێشانی ئەو وزەی ژیانەوە بۆ

لای خۆی، وای لێ بکات کڵپە بسێنێت. بە درێژایی دوو ساڵ، کاتێک تۆ بە یاریی کاغەز و بە ئازاردانی ژن و منداڵەکانتەوە خەریک بوویت، یا خەریکی قسەی بێسەروبەری سیاسی بوویت، لە ژوورێکی تاریکدا ڕۆژانە چەند سات دادەنیشتم و دەمڕوانی، تا دڵنیا بم لەوەی وزەی ژیانی تۆم دۆزیوەتەوە. بەرەبەرەیش شێوازێک فێر بووم، تا لە ڕێگەیەوە بتوانم پێشانی خەڵکی تریشی بدەم، پاشان بۆم دەرکەوت، ئەوانیش هەمان شتیان دەبینی.

ئەگەر ئێستا تۆ پزیشکێک بیت و لەو بڕوایەدا بیت کە "ڕۆح" دەرئەنجامی تێکچوون و ئاساییکارنەکردنی ئەو ئەندامانەی لەشن کە ئەنزیمەکانیان ڕاستەوخۆ تێکەڵ بە خوێن نابن، دەڵێیت: "ئەو نەخۆشانەی چاکت کردوونەتەوە، دەستهات و بەرەوپێشچوونت لە دۆزینەوەی ڕێگاچارەدا بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکان، هیچ نین لە "بەهرە"یەک زیاتر کە لەو ڕێیەوە دەتوانیت ویست و خواستەکانی خۆت بسەپێنیت." ئەگەریش بە دەست دوودڵییەوە ئازار بچێژیت، یا لە تاریکی بترسیت، دەڵێیت: "ئەو دیاردەیەی تۆ بەر لە ماوەیەک بە دیت کردووە، هیچی تر نییە لە هەوڵدان زیاتر بۆ سەپاندنی خواست و ویستەکانی خۆت و لەوە دەچێت لە جڤینێکدا بۆ ئامادەکردنی "ڕۆحەکان" دانیشتبیت!" تۆ ئاوایت، گرگن! چۆن ساڵی ١٩٢٠ نکوڵیت لە هەبوون "ڕۆح" دەکرد، ئێستایش کە ساڵی ١٩٥٤ە، بێهوودە، هەر لەسەر هەمان فلتەفلت لە بارەی "ڕۆح"ەوە بەردەوامیت. ئێستایش، هەر هەمان پیاوی بچووکی. ساڵی ١٩٨٤یش، بێدوودڵی و سڵەمینەوە، "ئۆرگۆن" دەکەیت بە مایەی بەدەستهێنانی پارەیەکی زۆر و لەسەر هەمان کردەوەیش بەردەوام دەبیت کە گاڵتە بە هەقیقەتێکی دی بکەیت و لە نرخی کەم بکەیتەوە و بە خراپە باسی بکەیت، کتومت وەک ئەوەی لەگەڵ دۆزینەوەی "ڕۆح" و دۆزینەوەی وزەی "کۆسمیک"یدا کردت. لەسەر ئەوەیش بەردەوام دەبیت، ڕێک وەک هەمان پیاوە ڕەخنەگرە گرگنەکەی جاران، دەمێک لێرە و دەمێک لەوێ، خەریکی هاتوهاوار و با بژی و با بژی خۆت بیت و دەستی لێ هەڵناگریت.

دێتەوە یادت چۆن گاڵتەت بەو دۆزینەوەیە دەکرد کە سەقامگیربوونی زەوی سەلماند. ئەو دۆزینەوەیەی سەلماندی زەوی بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە و وەستاو نییە! تۆ دەتوت: "ئەگەر وا بێت کە زەوی دەسووڕێت، دەبێت ئەو لێوانانەی لەسەر سینیی مەیگێڕەکەن بکەونە خوارەوە." ئەمە چەند چاخێک لەمەوبەر بوو. بێگومان لە یادت کردووە، گرگن! تۆ هەر هێندە لە بارەی نیوتنەوە دەزانیت کە دیویێتی سێوێک لە دارێک بەر بووەتەوە. هێندەیش لە بارەی ڕۆسۆوە دەزانیت، کە دەیویست "بگەڕێتەوە بۆ سروشت"، تەنیا شتێکیش کە لە دارویینەوە فێری بوویت، "خەبات لە پێناوی مانەوەدا"یە، بەڵام هیچ لە بارەی ڕەچەڵەکی خۆتەوە کە دەگەڕێیتەوە سەر مەیموون، فێر نەبوویت. لە فاوستەکەی گۆتەیش، کە بە خۆشحاڵییەوە و زوو زوو بە نموونە دەیهێنیتەوە، هێندە تێگەیشتوویت کە پشیلەیەک لە ماتماتیک دەگات. تۆ، دەبەنگ و گەلۆر و کەللەڕەق و پووت و مەیموونئاسایت، پیاوی بچووک! لەگەڵ ئەوەیشدا کە دڵنیایت لە کارامەییت لە پێکانی ئەو نیشانەیەدا بۆت دانراوە، بەڵام هەمیشە ئەو جێیە دەپێکیت کە مەبەستت نییە. کتێبخانەکانت بە ناپۆلیۆنەکەت؛ ئەو پیاوە گرگنەی کە شتێکی تری لە پاش جێ نەماوە لە مافی سەربازیی گشتی؛ "سەربازی بۆ هەمووان" زیاتر، ڕازاندۆتەوە، بەڵام کێپلەر کە لە نزیکەوە لە بنەچە و ڕەچەڵەکە گەردوونییەکەت گەیشتبوو، لە هیچ یەکێک لە کتێبخانەکانتدا، دەست ناکەوێت. هەربۆیەیش، لەو کڵۆڵییەی تێی کەوتوویت، قوتارت نابێت، پیاوی بچووک! سەرزەنشت و سەرکۆنەت دەکەم، کاتێک لەو بڕوایەدایت، کە من دوای ماندووبوون و خەریکبوونێکی دوورودرێژ ـ با لەوە بگەڕێین کە ئەو ماندووبوون و خەریکبوونە، چ خەرجییەکەی خواستووە ـ گوایا دەمەوێت لە ڕێگای سەپاندنی خواست و ویستەکانی خۆمەوە، بڕوات بە هەبوونی وزەی "ئۆرگۆن"ی لە گەردووندا پێ بهێنم!

نا، پیاوی بچووک! لەڕاستیدا لە ڕێگای ئەو هەموو قوربانی و خۆبەختکردنەوە خۆم فێر کرد چۆن چارەسەری دەردەکەی نێو لەشی تۆ بکەم. تۆ، بڕوا بەمە ناهێنیت. لە نەرویج گوێم لێت

بوو دەتوت: "کەسێک ئەو هەموو پارەیەی بۆ تاقیکردنەوەکانی تەرخان کردبێت، بە هەموو مانایەک شێتە." تێت گەیشتم، چونکە لە خۆتەوە و لە ئەزموونەکانی خۆتەوە، دەڕوانیت. تۆ، دەتوانیت تەنیا وەربگریت و ناتوانیت ببەخشیت. هەربۆیەیش لەوە تێ ناگەیت کە مرۆڤێک دەتوانێت بەوە شاد و خەنی بێت ببەخشێت. کتومت وەک ئەوەی کە لەوە تێ ناگەیت کە ژن و پیاوێک بەبێ ئەوەی هەڵکوتنە سەر یەکتر و پەلی یەکتر بۆ نێو "جێگای نووستن" ڕابکێشن، دەتوانن پێکەوە لە ژوورێکدا بن.

دەمتوانی ڕێزت بگرم ئەگەر کارامە و بەدەستوبرد بوویتایە لەوەدا کە بەختیاری بۆ خۆت بدزیت، بەڵام تۆ دزێکی نەوێر و گرگنی. تۆ زیرەک و کارامە و بەدەستوبردیت، بەڵام چونکە لە باری دەروونییەوە ڕەقوتەق و وشکهەڵاتوویت، لە تواناتدا نییە بخولقێنیت. هەروەک چۆن فرۆید جارێک لە جاران پێی وتیت: "ئێسکێک دەدزیت و خۆت لە قوڕنەیەک دەئاخنیت، تا بتوانیت بیخۆیت." لە دەوری کەسانی دڵاوا و بەخشندە کۆ دەبیتەوە، تا دواپوولیان لە ژێر چنگ دەردەهێنیت. خوێنمژەکە تۆیت، بەڵام بەو جۆرە ناحەزەی کە بیر دەکەیتەوە، کەسانی بەخشندە و دڵاوا بە خوێنمژ ناو دەبەیت. ورگی خۆت لە توانا و زانیارییەکانی ئەوان و لە مەزنی و بەختیاریی ئەوان پڕ دەکەیت، بەڵام ئەوی قوتت داوە ناتوانیت هەزمی بکەیت و یەکسەر دەیکەیت بە گوو و بۆنێک کە سەردار بێ سەر دەکات بە هەموو لایەکدا بڵاو دەکەیتەوە، یا بۆ ئەوەی دزییەکەت داپۆشیت و نرخی خۆت لە دەست نەدەیت، نێچیرەکەت بە دەبەنگ و مندالفریوێن و هەڵخەڵەتێن ناودیر دەکەیت.

ڕاوەستە "مندالفریوێن!" ڕاوەستە!

دێتەوە یادت پیاوی بچووک! ـ ئەوسا دەمراستی یەکێتییەکی زانستی بوویت ـ گوناهبارت کردم بەوەی گوایا ڕێم داوە بە منداڵەکانم سەیری دیمەنەکانی گانکردن بکەن؟ ئەوکات، تازەکی یەکەم وتارم

لە بارەی مافە جنسییەکانی منداڵانەوە بڵاو کردبووەوە. جارێکی تریشت دێتەوە یاد ـ ئەمجارەیان دەمڕاستی یەکێک لە ڕێکخراوە فەرهەنگییەکان بوویت لە بەرلین ـ بانگەشەی ئەوەت کردبوو کە گوایا کچانی گەنجم لەگەڵ خۆمدا سوار دەکرد و بەرەو دارستانەکان دەمبردن، تا فریویان بدەم و لە خشتەیان ببەم؟ من؛ قەت کچێکی گەنجم فریو نەداوە، ئەمە خەیاڵ و ئەندێشەکانی تۆن، نەک هی من، گرگن! من، ژنەکەم، یا کچەدۆستەکەم، خۆش دەوێت. وەک تۆ نیم، کە لە تواناتدا نییە ژنەکەتت خۆش بووێت، بۆیە کچانی گەنج بەرەو دارستانەکان فریو دەدەیت.



*کچی ئەم یا ئەو شۆڕش.*

ئەی تۆ کچە گەنجەکە! تۆیش خەون بە یەکێک لە پاڵەوانەکانی سینەماوە نابینیت؟ لەگەڵ وێنەکەیدا ناچیتە نێو جێگای نووستنەکەتەوە؟ بە دوایدا نەگەڕایت و وا خۆتت پێشان نەدا کە تەمەنت هەژدە ساڵانە و لە خشتەت نەبرد؟ پاشان، بە تاوانی ئەوەی گوایا دەستدرێژی لێ کردوویت، ڕاپێچت نەکرد بۆ بەردەمی دادگا؟ "ئەو" دوای دادگا، یا بەر دەدرێت، یا دەخرێتە زیندانەوە. دایک و داپیرەکانت، مینا خودی خۆت، دەستەکانی ئەو پاڵەوانە گەورەیەی

سینەما ماچ دەکەن. دەتویست، لەگەڵ ئەو پاڵەوانە بەنێوبانگەی سینەمادا بخەویت، بەڵام هێندە ئازا و بوێر نەبوویت کە بەرپرسیی ئەو خواست و کارەت لە ئەستۆ بگریت و هەموو گوناهەکانت خستە ئەستۆی ئەو و بە دەستدرێژیکردن بۆ سەر ئابرووت تاوانبارت کرد. تۆ؛ کچە بەستەزمانە بچووکە بەزۆرگایراوەکە! یا تۆ؛ ئەی ئەو ژنە بەستەزمانەی بە زۆر دەستدرێژی کراوەتە سەر نامووست، تۆ کە ڕەحەتبوونی جنسیت لەگەڵ شۆفێرەکەتدا بە دەست دەهێنا لەبریی مێردەکەت، شۆفێرە ڕەشپێستەکەت لە خشتە نەبرد و فریوت نەدا، لەبەر ئەوەی جنسی ئەو نزیکتر بوو لە جەنگەڵەکانی ئەفریقاوە. دواتریش، بەوە تاوانبارت نەکرد کە دەستدرێژی کردووەتە سەر نامووست! بوونەوەرە لێقەوماوە بەستەزمانەکە، تۆ قوربانیی دەستی ئەو ڕەگەزەیت کە هەمیشە لە ژێرەوە بووە. نا، نا، بێگومان! تۆ لە ڕەگەزێکی پاک و سپی بوویت، تۆ "ئەندامی ئەم یا ئەو ڕێکخراوەی ژنانی ئەم یا ئەو شۆڕش بوویت"، دانیشتووی وڵاتێکی باکوور، یا باشوور، ئەوەی باپیرەی بە ڕاکێشانی ئەفریقاییە ڕەشپێستە ئازاد و سەربەستەکان بەرەو کۆت و زنجیرە ئەمەریکاییەکان، دەوڵەمەند و زەنگین بوو.

چەندە بێگوناهـ و چەند پاک و بێگەرد و چەندێ سپیت، هیچ ئارەزوویەکت بەرانبەر ڕەشپێستەکان نییە. تۆ ژنە ترسنۆکە بەستەزمانە کلۆڵە گرگنەکە، نەوەی ڕەگەزە نەخۆشەکە، نەوەی ڕاوکەرانی کوێلەکان، وەچەی ئەو "کۆرتێز"ە بەد و سەگسارەی کە هەزاران "ئەزتێکت"ی خۆشباوەڕی هەڵخەڵەتاند و کردنی بە تەڵەوە بۆ ئەوەی دواتر بتوانێت لە پشتەوە بیانکوژێت.

ئێوە، ئەی کچە بەستەزمانەکانی ئەم یا ئەو شۆڕش! چی لە ڕزگاری تێگەیشتن؟ چی لە تاسە و ئارەزووی شۆڕشگێڕانەی شۆڕشگێڕان، یا لەو لینکۆڵنە تێگەیشتن کە کۆیلەکانی ڕزگار کرد، ئەو کۆیلانەی پاشان فڕێتاندانە نێو "بازاڕی بەرابەرکێی سەربەستەوە"؟ خۆتان لە ئاوێنەدا ببینن، ئەوسا لە خۆتاندا "کچانی شۆڕشی ڕووسی" دەبینن و دەیانناسنەوە، ئێوە کچە بێگوناهـ و پاک و بێگەردەکان.

ئەگەر ئێوە جارێک لە جاران بتانتوانیایە پیاوێکتان خۆشت بووێت، چەندان ڕەشپێست و جوولەکە و کرێکار لە چنگی مەرگ قوتار دەبـوون و ژیانیان لە دەسـت نـەدەدا! کتومت چۆن لە ڕێگای منداڵەکانتانەوە ئەو زیندووییە دەکوژن کە لە خۆتاندا هەیە، ئاوایش لە ڕێگای ڕەشپێستەکانەوە نزیکبوونەوەتان لە خۆشەویستی و ئەندێشە و ئارەزووکانتان، کە بوون بە چەند پێشچاو و دیمەنێکی نـاحـەز لـە خۆشەویستیکردن، دەکـوژن. دەتـانـنـاسـم، کچانی پیاوە دارا و دەستڕۆیشتووەکان، دەزانـم ناوگەڵە ڕەقوتەق و وشکهەڵاتووەکانتان چ بەدکاری و ناپەسەندییەک دەخوڵقێنێت؟

نا، تۆ ئەی کچەکەی ئەم شۆڕش یا ئەویان، من هیچ نیازێکم نییە ببم بە دادوەر یا پۆلیس. ئەمە بۆ نموونە جوانەکانی نێو کۆمەڵەکەت، ئەوانەی جلکی ڕەسمی و فەرمانبەرییان پۆشیوە، بە جێ دەهێڵم. من، باڵندەکان و ئاسکەکان و سمۆرەکانم خۆش دەوێت، چونکە هاوڕێیانی نزیکی ڕەشپێستەکانن. مەبەستم لە ڕەشپێستەکانی جەنگەڵە، نەک ئەوانەی لە "هەرلێم" بە جلوبەرگی شیک و ئاڵووالاوە دەگەڕێن. مەبەستم لەو ژنە ڕەشپێستە قەڵەو و گوارەلەگوێیە نییە کە حەز و ئـارەزووە بەدینەهاتووەکانی بەرەو زێدەڕۆیی ئایینی ڕاپێچیان کـردووە و بـووە بە مایەی قەڵەوبوونی. مەبەستم لە لەشولاری ناسکۆڵە و نەرمونیای کچانی زەریای باشوورە کە تۆی پیس و پەڵۆخ و بۆگەن، تۆی سەر بەم سوپا یا ئەویان دەینێیتە ژێر خۆت. ئەو کچانەی لەوە بێئاگان کە تۆ خۆشەویستییە پاکەکەیان وەک لەشی ژنە قەحبەکانی دێنڤەر دەبینیت.

کچی بچووک، تۆ تاسە و ئارەزووی ژیانێک دەکەیت کە هێشتا لەوە بێئاگایە دەچەوسێنرێتەوە و مایەی ڕقوکینەیە. ئێستا لە گیانەلادایت. چیی تر بەو سیفەتەی کە خامایەکی لە ڕەگەزێکی پاک لە ئەڵمانیا ناتوانیت بە کـار بیت، بـەڵام تا ئێستایش بە ناوی کچی ڕووسی و کچی شۆڕشی ئەمەریکاییەوە لەنێوماندا دەژیت. دوای چەند چاخێکی تر، کاتێک کوڕ و کچانی تەندروست تاموچێژ لە ئەوین وەردەگرن و پارێزگاری لێ دەکەن، تەنیا یەک

بیرەوەری لە تۆ دەمێنێتەوە و ئەویش مایەی هەموو پێڕابواردن و سووکایەتییەکە.

تۆ نەبوویت؛ ئەی ئەو ژنەی شێرپەنجە دایوەشاندوویت، ڕێت نەدا ماریان ئەندەشێن؛ ئەو دەنگە زیندووەی ژیان، هۆڵی کۆبوونەوەکانت بە کار بهێنێت؟ دوای ئەوەیش ئەم هەسارەیەی لەسەری دەژین هیچ جێپەنجەیەکی تۆی پێوە نامێنێت، ناوی ماریان ئەندەشێن لە تەواوی چاخەکاندا دەزرنگێتەوە. هەرچەند ناتوانم لە خۆم نەپرسم کە ئاخۆ ئەویش دوور دەڕوانێت، یا بووە بە لەمپەرێک لە بەردەمی منداڵەکەیدا و ناهێڵێت تاموچێژ لە خۆشەویستی وەربگرێت! نازانم! ژیان بۆ خۆی چەندان وەرچەرخان و هەڵبەز و دابەزی تێدایە و بەوەیش شاد و خەنییە کە لە خودی خۆیدا دەژی، نەک لەنێو تۆدا، ژنە بە شێرپەنجە داوەشاوە نەخۆشە گرگنەکە!

پێت وایە و بانگەشەی ئەوە دەکەیت کە "ژینی نێو کۆمەڵ" و "کۆمەڵ" خۆتیت، ژنکۆک! ئەو کۆمەڵەی کە پیاوە گرگنەکەت بە تووک و پێستەوە هەڵیلووشیوە، بەڵام تۆ نە ژینی نێو کۆمەڵ و نە کۆمەڵیت. تۆ لە ڕۆژنامە ئایینییەکانتدا هەمیشە دەربارەی ئەوە دەنووسیت کە کچەکەت چ کاتێک بۆی هەیە و ڕێی پێ دەدرێت پیاوێک لە ئامێز بگرێت، بەڵام هیچ مرۆڤێکی دانا و وریا گرنگی بەوە نادات!

"کۆمەڵ" لە دارتاش و بەنا و باخەوان و مامۆستا و دۆکتۆر و کرێکارانی پیشەساز و من پێک دێت. ئێمەین "ژیانی کۆمەڵایەتی"، نەک تۆ، ژنە ڕەقوتەقە، نەخۆشە، کرمژنەکە! تۆ ژیان نیت، بەڵکو گەورەترین نەفرەتێکی تێیدا، بەڵام دەزانم بۆ خۆت لە قەڵا شوورە بەدەورکراوەنتدا، لەگەڵ هەموو پوول و پارەکانتدا، توند کردووە. ئەمە تەنیا شتێک بوو کە دەتتوانی دەرهەق بە تەسکبینی و نزمیت بەرانبەر بە دارتاشەکان و بەناکان و باخەوانەکان و مامۆستاکان و کرێکارە پیشەسازەکان و دۆکتۆرەکان بیکەیت. لەو قاڵب و چوارچێوانەی ئەم چاوەقووڵکەیەیان لە خۆ گرتووە، ئەوە تەنیا

کارێکی چاک بوو کردبێتت. نزمی و هیچلەباردانەبوویيت، مۆخ و ئێسکی گرتویتەتەوە و بووە بە مایەی قەبزبوون و تووشبوونت بە ڕۆماتیزم، بووە بەو دەمامکەی کەسایەتیی خۆتت لە پاڵدا حەشارداوە، بە ڕەتکردنەوە و ڕقت بەرانبەر بە ژیان! تۆ؛ ژنە بەستەزمانە بچووکەکە، بەختیار نیت، چونکە کوڕەکانت لە نێو دەچن و کچەکانت دەبن بە قەحبە و مێردەکەت وشک دەبێتەوە و ژیان و دەمارەکانت بۆگەن دەکەن. ناتوانیت فریوم بدەیت، کچە گرگنەکەی شۆڕش، چونکە ڕووتوقووت بینیومیت.



*دەمنادەمێک، سەر لەو گڵۆڵییەی تێی کەوتوویت دەردەهێنیت و هاوار دەکەیت: بژی! بژی!*

کچی ئەم شۆڕش یا ئەویان، تۆ هەمیشە ترسنۆک بوویت. تۆ بەختیاریی مرۆڤایەتیت لە دەستدا بوو، دۆڕاندت. چەندان سەرکۆمارت بە مەرامی خۆیان گەیاند و نزمی و هیچلەباردانەبوویی خۆتت پێ بەخشین. سەرکۆمارەکانت، مەدالیا بەسەر خەڵکیدا دەبەخشنەوە و وێنەیان دەگیرێت و بۆ دوایین جار پێدەکەنن و ناوێرن ڕووبەڕووی ژیان ببنەوە. دنیا لەسەر لەپی دەستەکانت بوو. چیت لێ کرد و بە چیت گەیاند؟ تۆ بۆمبی ئەتۆمیت بەسەر

هیرۆشیما و ناکازاکیدا باراند، مەبەستم لە کوڕەکەتە، ئەو کوڕەی هەر بۆ تاقیکردنەوە و بۆ ئەوەی بزانێت چی ڕوو دەدات، ئەو شارانەی بۆمباران کرد. تۆ بە خۆت گۆڕەکەی خۆت هەڵکەند، ژنی گرگن! بەم بۆمبارانەت، چین و ڕەگەزەکەتت بە بێدەنگیی تاهەتایی نێو گۆڕ سپارد، چونکە هێندە ئینسان نەبوویت، پیاوان و منداڵان و ژنانی هیرۆشیما و ناکازاکی لە ئاکامی ئەم کارەساتە ئاگادار بکەیت. نەتتوانی وەک مرۆڤێک هەڵسوکەت بکەیت، بۆیە بێدەنگ و مینا بەردێک بە قووڵایی زەریادا ڕۆچوویت و ونبوویت. گرنگ نییە، ئێستا چی دەڵێیت و چۆن بیر دەکەیتەوە، ئەی ئەو ژنە گرگنەی چەندان سوپاسالاری گەلۆر و دەبەنگت هێناوەتە دنیاوە. لە داهاتوودا خەڵکی پێت پێ دەکەنن و سەرسووڕماو و حەپەساو دەڕواننە کار و کردەوەکانت. ئێستا کە نەبوویت بە مایەی گاڵتە و خەڵکی سەریان لێت سووڕ نەماوە، بەشێکە لەو کڵۆڵییەی دنیای گرتووەتەوە.

دەزانم ژنکۆک! گشت ڕووداوەکان و "پارێزگاری لە نیشتمان" و هەرچییەکی تر کە ڕوو دەدەن، بە خێر بۆ تۆ دەگەڕێنەوە. زۆر دەمێک لەمەوبەر، ئەمەم لە نەمسا بەر گوێ کەوت. قەت لە عەرەبانچییەکەی خەڵکی ڤییەنات بیستووە، بڵێت: "نەمری و سەربڵندی بۆ قەیسەر!"؟ نەتبیستووە؟ گرنگ نییە؟ گوێ لە خۆت بگرە، هەمان ئاواز لە نێو تۆیشدا دەنگ دەداتەوە. نا، ژنکۆک! لێت ناترسم، ناتوانیت هیچ شتێک دەرهەق بە من بکەیت. دەزانم زاواکەت دادوەرە، یا برازاکەت باجگری شارە و بۆ چاخواردنەوەیەک بانگی دەکەیت و چەند شتێک لە بارەی منەوە بە گوێیدا دەچرپێنیت. ئەویش لەبەر ئەوەی دەیەوێت پلەوپایەیەکی بەرزتر بە دەست بهێنێت، یا بۆ چەسپاندنی تەکووزی و یاساکان، بە دوای نێچیرێکدا دەگەڕێت. دەزانم چۆن دەکەیت و چی ڕوو دەدات. ناتوانیت بەو جۆرە خۆت ڕزگار بکەیت، ژنی بچووک. هەقیقەتەکەی لای من بەهێزترە لەوەی تۆ.

"یەکلایی دەبینێت، دەمارگیرە! ئەی من هیچ ڕۆڵێکم لە کۆمەڵدا نییە؟"

من تەنیا ئەوەندەم پێشان داوە کە ئەنگۆ بە چ جۆرێک بچووک و بەدکارن، پیاوی بچووک، ژنی بچووک. ناوی ڕۆڵ و گرنگیی ئێوەم نەهێناوە. لەو بڕوایەدایت ژیانی خۆمم بخستایەتە مەترسییەوە، ئەگەر پێم وا نەبووایە گرنگیت؟ هیچوپووچی و بێمانایيت، سووکی و نزمیت، لەبەر ڕۆشنایی ڕۆڵی گرنگی تۆ و ئەو بەرپرسییە زەبەلاحەی لە ئەستۆتدایە، تا بێت تۆقێنەرتر دەنوێنێت. ئەوان دەڵێن: "تۆ دەبەنگیت"، من دەڵێم: "تۆ زیرەکیت، بەڵام ترسنۆکیت." ئەوان دەڵێن: "تۆ بەرماوەی کۆمەڵی مرۆڤایەتیت." من دەڵێم: "تۆ، تۆوی ئەو کۆمەڵەیەت." ئەوان دەڵێن: "کولتوور پێویستی بە کۆیلە هەیە."، من دەڵێم: "هیچ کولتوورێک بە دەستی کۆیلە بونیاد نانرێت." ئەم چاخە نوێ ترسێنەرە؛ چاخی بیستەم، ئەوەی سەلماند کە هەر تێگە و دۆزێک دەربارەی کولتوورە، دوای پلاتۆن، مایەی لاقرتی و گاڵتەپێکردنە. قەت کولتوورێکی ئینسانی لە ئارادا نەبووە، گرگن! ئێمە تازەکی خەریکین لە سەراسیمەیی و سەرگەردانییە تۆقێنەرەکەی بوونەوەرە ئینسانییەکە و نەخۆشە تایبەتییەکانی دەگەین. ئەم نووسراوەیە؛ "وتەیەک بۆ پیاوە بچووکەکە" و هەر نووسراوەیەکی تر کە لە ئەمڕۆدا جێی متمانە و باوەڕن، هێندە لەو کولتوورەوە نزیکن کە لە چاخەکانی داهاتوودا بونیاد دەنرێت، کە "دیزڵلوک"ی ئەمڕۆ لەو پێچکەیەوە نزیکە کە بەر لە هەزاران ساڵ دروست کرا.

تۆ نزیکبینیت، قەت بیر لە داهاتوو ناکەیتەوە، پیاوی بچووک! ناتوانیت دوورتر لەو ماوەیەی لە نێوان بەرچایی و فراژیدایە، بڕوانیت. پێویستە خۆت فێر بکەیت بیر لە چەندان چاخی ڕابوردوو، لە چەندان چاخی داهاتوو، بکەیتەوە. دەبێت بیرکردنەوەکانت لە دەوری زیندوویی ژیان بسوڕێنەوە، لە ئاست ئەو بەرەوپێشچوون و گەشەکردنەدا بن کە یەکەم بوونەوەریی خانەیی کرد بەو بوونەوەرەی ناوی "مرۆڤ"ە، ئەو بوونەوەرەی ئێستا قنج و قیت ڕاوەستاوە، بەڵام ناتوانێت ڕاست و ڕەوان بیر بکاتەوە. هیچ ڕووداوێکی چەند ساڵێک لەمەوبەرت نایەتەوە یاد، بۆیە دوو

هەزار ساڵە، هەمان کار و کردەوەی گەلۆرانە دووپات دەکەیتەوە. لەمەیش خراپتر، تۆ وەک گەنەیەک بە کارە پڕوپووچەکانی خۆتەوە نووساویت و لێیان نابیتەوە، لە ڕەگەز، نەتەوە، زەبروزەنگی ئایینی و ژێرپێخستن و چەوساندنەوەی ئەوین نابیتەوە. ناوێری سەیر بکەیت کە بە چ قووڵاییەک بەنێو کلۆڵیی خۆتدا ڕۆچوویت. جارناجارێک سەر لە کلۆڵییەکەت دەردەهێنیت و هاوار دەکەیت: "بژی! بژی!". بۆقێکی قیڕەقیڕکەر لە قوڕولیتاوەکەی خۆیدا لە تۆ زیاتر لە ژیانەوە نزیکترە.

"بۆ لە چنگ ئەم کلۆڵییە ڕزگارم ناکەیت؟ بۆ بەشداریی کۆبوونەوە و کۆنفرانسی پارتییەکەم نابیت؟ تۆ خاینیت! تۆ لە پێناوی مندا جەنگاویت، ئازارت چەشتووە و قوربانیت داوە، کەچی ئێستا گاڵتەم پێ دەکەیت!"

ناتوانم لەو کلۆڵییە قوتارت بکەم. تەنیا خۆت دەتوانیت خۆت ڕزگار بکەیت، خۆت. هیچ کاتێک لە کۆبوونەوە و کۆنفرانسەکانتدا بەشداریم نەکردووە، چونکە تێیاندا دەوترێت: "بڕوخێت شتە گرنگەکان! لێگەڕێن با لە شتە بێبایەخ و لاوەکییەکان بدوێین!" ڕاستە، بە درێژایی بیست ساڵی ڕەبەق لە پێناو تۆدا جەنگیم. دڵنیایی کارەکەم و گەرموگوڕیی نێو خێزانەکەمم لە پێناوی تۆدا کردە قوربانی، پارەوپوولێکی زۆرم بە ڕێکخراوەکانت بەخشی، بەشداریی خۆپێشاندانەکانم کردویت و لەگەڵ ڕەوتی برسیبوونتدا بووم. بەبێ ئەوەی هیچ بەخشش و پاداشتێکت پێدابم، مینا پزیشکێک، هەزاران سات لە کارەکەی خۆمم پێ بەخشیویت. لە پێناوی تۆدا و زۆرجارانیش لەبریی تۆ کاتێک تۆ قوڕگی خۆتت بە هاتوهاوار و پێداهەڵدانی سەروەرەکانت دەنووساند، وڵاتە و وڵات ڕاونراوم و لە بەرەنگاریکردن و دژایەتیی پەتا سیاسییەکەدا ئامادە بووم لە پێناوی تۆدا خۆم بەخت بکەم. لەگەڵ ئەوەیشدا کە ژیانم لە مەترسیدا بووە، چەندان جار ژیانی تۆم پاراستووە، لە کاتی خۆپێشاندانەکانتدا پارێزگاریم لە منداڵان کردووە و لە دەستدرێژیی پۆلیس پاراستوومن. یارمەتیم دوایت، هەرچی پارە و سامانێکم لە دەستدا بووە، بۆ دامەزراندنی دامەزراوەی

تایبەت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکانت بە کارم هێناوە، ئەو دامەزراوانەی کە لە ڕێگایانەوە دەتتوانی یارمەتی و ئامۆژگاری بە دەست بهێنیت. تۆ، هەر لێت وەردەگرتم و قەت هیچت لە پاداشتدا نەدەدایەوە. هەر هێندەت دەویست خۆ ڕزگار بکەیت، بەڵام بە درێژاییی سی ساڵی پڕ لە دەردی تۆقێنەر، هیچ بیرکردنەوەیەکی بەبەرهەمت نەبوو. کاتێکیش جەنگی جیهانگری دووەمت کۆتایی هات، لە هەمان جێگەدا خۆت بینییەوە کە بەر لە جەنگ تێیدا بوویت، لەوانەیە کەمێک بە لای "چەپ"، یا کەمێک بە لای "ڕاست"دا لاتدابێت، بەڵام یەک میلیمەتر بەرەپێش نەچووبوویت. تۆ، بە نووکەشەق ڕزگارییە گەورەکەی فرەنسات لە خۆت دوور خستەوە و کردت بە ترسوبیمێکی وا کە هەموو دنیای گرتەوە. ئەم هەڵە گەورانەت کە تەنیا کەسانی گەورە لێیان تێدەگەن، بەبێ ئەوەی بە دەستی تۆوە شێت و هار ببن، بەبێ ئەوەی ڕقت لێ هەڵبگرن، ئەم هەڵە گەورانەت، دوودڵییەک بە دوای خۆیاندا کێش دەکەن کە دنیایەک ـ هەر نەبێت ئەو بەشەی دنیا کە ئامادە بوو لە پێناوی تۆدا ببێت بە قوربانی ـ بە دەستیەوە دەیناڵاند. بە درێژایی ئەو نیوچاخە پڕ لە کوشتن و بڕینە، هیچ شتێکی ماقوڵت دەرنەبڕی و هەر لەسەر کلێشە قۆڕەکانت و لەسەر دەبەنگی و گەلۆریی خۆت بەردەوام بوویت.

تا ئێستایش دەستم لێ هەڵنەگرتوویت، چونکە لەو ماوەیەدا خۆم فێر کرد کە چاکتر و قووڵتر لە نەخۆشییەکەت تێ بگەم. ئێستا تێدەگەم بۆ نە دەتوانیت بە جۆرێکی تر بیر بکەیتەوە کە بیرت کردووەتەوە و نە بە جۆرێکی تر هەڵسوکەوت بکەیت. لەنێو تۆدا ئەو ترسە مردووەم دۆزیەوە کە بەرانبەر بە زیندوویی ژیان هەتبوو. ترسێک، ئەگەرچی بیشخوازیت بە ڕێکی دەست پێ بکەیت، دەتخاتە سەر لاڕێکان. تۆ، لەوە تێ ناگەیت کە هیواکان دەرئەنجامی توانا و زانستییەکانی خۆتن. خۆت بە هیوا و خۆزیاکان فوو دەدەیت و ناتوانیت لە خۆتیان دەربکەیت. هەربۆیەیش کاتێک بیر لەو هەژەندە گشتییەی دنیاکەتی گرتۆتەوە دەکەیتەوە، بە "ڕووناکبین" ناودێرم دەکەیت، گرگن! بەڵێ، من ڕووناکبینم و پڕیشم لە داهاتوو.



تا ڕۆژێک لە ڕۆژان چاوەکانم کردەوە و ڕووبەڕووت وەستام و تێمڕوانیت.

چۆن ئەمە دەبێت؟

بۆت دەگێڕمەوە:

چەند زیاتر لێتەوە نزیک بووم، بەو جۆرەی کە هەبوویت و هەیت، هێندە زیاتر سەروسەکوتت بە نزمی و سووکیی خۆت کوتاومەتەوە. هەزاران جار ئەوەم لە یاد کرد، چیت لە دژی من دەکرد، کاتێک دەستی یارمەتیم بۆ درێژ دەکریت. هەزاران جار، نەخۆشییەکەتت بە بیر هێناومەتەوە، تا ڕۆژێک لە ڕۆژان، چاوەکانم کردەوە و ڕووبەڕووت ڕاوەستام و تێمڕوانیت. سەرەتا، هەستم دەکرد چ ڕق و ڕقلێبوونەوەیەک بەرانبەر بە تۆ لە لەشمەوە هەڵدەقوولا، بەڵام لەڕێی تێگەیشتنمەوە لە نەخۆشییەکەت، خۆم فێر کرد چۆن بەرە بەرە دژی ئەو ڕقوکینەیە بوەستمەوە و بەری لێ بگرم. چیی تر دەرهەق بەو هەڵە دڵپرووێنانەی لە هەوڵدانەکانتدا بۆ بەڕێوەبردنی دنیاکەت دەردەکەون، تووڕە نەبووم لێت. لەوە تێگەیشتم ئەمانە شتێک نین بتوانیت خۆتیان لێ بپارێزیت، چونکە تۆ هەزاران ساڵ لە زیندوویی ژیانەوە دابڕاو و دوور بوویت.

پیاوە بچکۆلە ئازیزەکەم، کاتێک تۆ بە قیژەقیژ و هاوار دەوروبەرەکەت پڕ کردبوو و هاوارت دەکرد: "شێتە!" من یاسا بنچینەییە زیندووەکەی ژیانم دۆزیبووەوە. ئەوسا، تۆ دەروونناسێکی بچووک بوویت، دەروونناسێک کە ڕابوردوویەکی لە بزووتنەوەی لاواندا هەبوو، دەروونناسێک کە داهاتوو چاوەڕێی دەکرد، دەروونناسێک کە گرفتی ڕەحەتنەبوون تووشی نەخۆشیی دڵی کردبوو، دواتر هەمان نەخۆشی فڕێی دایتە نێو دەستی مەرگەوە، چونکە مرۆڤ ئەگەر پچێک نەزاکەتی تێدا بێت، کاتێک دەدزێت و لە پاشملە و بە خراپە لە بارەی خەڵکییەوە دەدوێت، لە دەست سزادان قوتاری نابێت. لە قوژبنێکی گیانتدا ئەوەت تێدا بوو، پیاوی بچووک. کاتێکیش پێت وا بوو کە ئیتر من کۆتاییم هاتووە، لە هاوڕێیەکی نزیکمەوە بوویت بە دوژمن و هەوڵت دا دواشەقم تێ هەڵبدەیت، چونکە دەتزانی کە لە تواناتدا نییە بڕوا

بەوە بهێنیت کە ڕاست بووم. چەند ساڵێک دواتر، کاتێک مینا ڕووناکبیرێکی چاوکراوە و بەهێزتر و بە بڕوایەکی پتەوترەوە گەڕامەوە، لە ترساندا زارەترەک بوویت و گیانت سپارد، چونکە بەر لەوە بۆت دەرکەوتبوو کە من بەسەر گشت ئەو چاڵە قووڵ و فراوانانەدا کە بۆت هەڵکەندبووم، دەرباز بووبووم. تۆ نەبوویت، لە ڕێکخراوەکەتدا تێگە و دۆزەکانی منت بە هی خۆت لە قەڵەم دابوو؟ ئەمە دەزانم، چونکە ئەندامە بەئەمەکەکانی نێو ڕێکخراوەکەت بۆیان گێڕاومەتەوە. نا، پیاوی بچووک! مرۆڤ بە گرتنەبەری تاکتیک، تەنیا بە گۆڕێکی ناوەخت دەگات و هیچی تر.

لەگەڵ تۆدا بوون، پڕ مەترسییە! مرۆڤ ناتوانێت لەگەڵ تۆدا لە هەقیقەتەوە نزیک بێت، بەبێ ئەوەی بێ ترس بێت لەوەی کە شەق لە پاشەڵی هەڵدەدرێت و دەستدرێژی دەکرێتە سەر و لە پاشملە بە خراپە باسی دەکرێت، هەربۆیەیش، خۆم لە تۆ دوورخستووەتەوە.

دووپاتی دەکەمەوە، لە ئێستات خۆم دوور خستووەتەوە، نەک لە داهاتووت. خۆم لە مرۆڤایەتیت دانەبڕیوە، بەڵکو لە نزمی و سووکیت، لە نائینسانبوونت، خۆم دوورەپەرێز گرتووە.

تەنیا لە پێناوی زیندوویی ژیاندا ئامادەی خۆبەختکردن و قوربانیدانم، نەک لە پێناوی تۆدا، پیاوی بچووک! تازەکی ئەوەم بۆ دەرکەوت، بیست ساڵ لەمەوبەر، چ هەڵەیەکی گەورەم کرد. ئەوسا، هەموو ژیانم بۆ تۆ تەرخان کردبوو، چونکە پێم وابوو "تۆ خۆت" زیندوویی ژیان و داهاتوو و هیوا بوویت. چەندان مرۆڤی سەرڕاست و ڕاستگۆ بەو هیوایەوە بوون زیندوویی ژیان لە تۆدا ببیننەوە، هەر هەموویان لە نێو چوون. دوای ئەوەی لەمە تێگەیشتم، بڕیام دا ڕێ لەوە بگرم سووکی و نزمیی تۆ و هیچلەباردانەبوویی تۆ لە نێوم ببات. شتی گرنگتر لە "تۆ" هەن، خۆمیان پێوە خەریک بکەم. من ژیانم دۆزیوەتەوە، گرگن! چیی تر بە زیندوویی ئەو ژیانەت ناگۆڕمەوە کە لە خۆمدا هەستم پێ کردووە و لەنێو "تۆ"دا بۆی گەڕاوم.

تەنیا بەوەی کە بتوانم ڕوون و ئاشکرا جۆری ژیانی تۆ لە چۆنێتیی کارکردنی ژیانی زیندوو جیا بکەمەوە، دەتوانم یارمەتییەکی ڕاستەقینەی داهاتووت و دڵنیابوون لە هەبوونی زیندوویی ژیان لە تۆدا بدەم. دەزانم، نکوڵیکردن لە تۆ، ئازایەتی و بوێری دەویت، بەڵام هەر لە بارێکی وادا دەتوانم لە کارکردندا بۆ داهاتووت بەردەوام بم، چونکە نە بەزەییم پێتدا دێتەوە و نە دەیشمەوێت وەک ڕابەرە بەدبەخت و کلۆڵەکانت بکرێم بە "پیاوێکی گەورەی گرگن."

تازەکی ژیان، کاتێک بە هەڵە لە لایەن تۆوە بە کار دەهێنرا، پشێوی نایەوە و یاخی بوو. ئەم پشێوی و یاخیبوونەی ژیان دەستپێکێکی گەورەیە بۆ داهاتووە گەورەکەت و کۆتاییەکی پڕ لە پەشیمانی و ئازارە بۆ ئەو نزمیوسووکییەی بووە بە بەرگی مرۆڤانی گرنگ و بستەباڵا. تەنیا لە کاتێکی وادا دەتوانیت نیشانەکانی ئەو دەردە دەستنیشان بکەین کە هەست و نەستەکانتی لە پەلوپۆ خستووە. ئێستا مرۆڤ تێبینی ئەوەی کردووە کە چاوەقووڵکەی هەست و نەستەکان، لەڕاستیدا، بە چ شێوەیەک کار دەکەن. ئەو دەردەی، کاتێ بڕیاری دابوو هەڵبکوتێتە سەر پۆڵۆنیا، ئەو وڵاتەی بەوە تاوانبار کرد کە نیازی هەبووە دەستدرێژیی سوپایی بکاتە سەری، ئەو دەردەی کاتێک بڕیاری دابوو دژەبەرکێکەی بکوژێت، بەوە تاوانباری دەکرد، کە گوایا "ئەو" نیازی کوشتن و لەنێوبردنی "ئەم"ی هەبووە. ئەو دەردەی، کاتێک بۆ خۆی بیر لە ئەنجامدانی بێشەرمی و بێئابرووییی دەکاتەوە، بە خراپە لە بارەی ژیانی تەندروست و پاکی کەسانی ترەوە دەدوێت و مۆرکی پیسبوونی پێوە دەنێت.

بە گیرمان هێناویت، پیاوی بچووک! پەردەمان لەسەر ڕاز و نیازەکان، لەسەر بەخۆدانازین و خۆبەزلزانینت، لەسەر پاڕانەوە و لاڵانەوەت بۆ بەدەستهێنانی بەزەیی، هەڵداوەتەوە. دەمانەوێت، بە هەوڵ و تەقەلا و کارکردن، ڕاستی و دروستیی بەرەوپێشچوونی دنیاکەت بسەلمێنیت. نامانەوێت خونخوارێک بە خونخوارێکی

لەو بەدتر بگۆڕیتەوە. تا بێت زیاتر، چۆن تۆ لە کەسانی تر داوا دەکەیت، داوات لێ دەکەین دان بە ڕاستیی یاسای ژیاندا بنێیت، بەپێی ئەو شێوازانەی بۆ ڕەخنەگرتن لە کەسای تر بە کاری دەهێنیت، خۆت چاکتر بکەیت. تا بێت زیاتر بەهرە و کارامەییت لە قسەهێنان و قسەبردندا، داواکانت، خۆدزینەوەت لە بەرپرسی، کە لەڕاستیدا نەخۆشییە هەرە سەرەکییەکەتە و ئەم دنیا جوانەی بۆگەن کردووە، ئاشکرا دەبێت. دەزانم، پێت خۆش نییە ئەمە ببیستیت، تۆ ئەوەت پێ باشترە، مینا هەڵگری داهاتووی کرێکاران، یا هەڵگری "ڕایخی چوارەم!" بقیژێنیت: "بژی! بژی!"، بەڵام پێم وایە چیی تر ئەو سەرکەوتنە بە دەست ناهێنیت، کە لە ڕابوردوودا بە دەستت هێنا. کلیلی نهێنییەکانتمان دۆزیوەتەوە، ئەو نهێنییانەی هەزاران ساڵە پەنهانت داون. تۆ، لە پشت دەمامکە کۆمەڵایەتی و دۆستایەتییە ڕووکەشەکەتەوە، بەدکاریت. ناتوانیت نیو ڕۆژ لەگەڵ مندا بە سەر بەریت، بەبێ ئەوەی خۆت بناسێنیت کە چۆن و چیت، بەبێ ئەوەی خۆت ئاشکرا بکەیت.



*تۆ، لە پشت دەمامکە کۆمەڵایەتی و دۆستایەتییە ڕووکەشەکەتەوە، بەد و سەرسەختیت.*

بڕوام پێ ناکەیت؟

دە با بە بیرت بهێنمەوە.

ئەو پاشنیوەڕۆ گەرمەت دێتەوە یاد هاتیت بۆ ماڵەکەم ـ ئەمجارەیان مینا داربڕێک ـ بە دوای کاردا دەگەڕایت؟ توولەسەگەکەم بەرەو ڕووت هات و هەڵبەز و دابەز خۆی بۆ هەڵدەدایت و یاریی لەگەڵدا دەکردیت. تێبینی ئەوەت کرد کە ئەو توولەیە دەکرێت ببێت بە سەگێکی چوست و چالاک بۆ ڕاو. وتت: "بۆ نایبەستیتەوە تا ببێت بە سەگێکی دڕ و ڕقی لە خەڵک ببێتەوە؟ ئەم توولەیە زۆر هۆگرە!" وەڵامم دایتەوە: "من سەگی دڕ و بەستراوەم ناوێت. سەگێکم ناوێت ڕقی لە خەڵک بێتەوە." داربڕە ئازیزەکەم، لە تۆ گەلێک زیاتر لەم دنیایەدا دوژمنم هەن، بەڵام سەگێکی هۆگرم دەوێت، نەک دڕ. سەگێکم دەوێت دۆستی غەریبان، نەک دوژمنیان.

ئەی ئەو یەکشەممە دڵپڕوێنەت دێتەوە بیر کە بێتاقەت و پشوولێبڕاو بە دەست ئەو بارە ناسروشتییەی لەشتی گرتووەتەوە، ماڵەکەمم بە جێ هێشت و ڕووم کردە مەیکەدەیەک؟ لەسەر مێزێک دانیشتم و داوای پێکێک ویسکیم کرد ـ نا پیاوی بچووک، من کەسێکی بەدمەست نیم، هەرچەند جارناجارێک حەز لە هەڵدانی پێکێک دەکەم ـ بەهەمەحاڵ، پێکێکم بانگ کرد و ئەوسا تۆ مەست بووبوویت و تازەکیش لە جەنگ گەڕابوویتەوە. گوێم لێت بوو وەسفی یابانییەکانت، وەک "مەیموونانی ناحەز و دزێو" دەکرد. پاشان، بەو سەروسیما ئاشنایەتەوە کە زۆر باش لە کاتی چارەسەرکردنتدا دیومە، وتت: "دەزانن دەبێت چی دەرهەق بەو مەیموونانەی سەر کەناری خۆراوا بکرێت؟ دەبێت هەر یەکێک لەوان هەڵبواسرێت، هەڵواسینێکی پەلە نا، بەڵکو هێواش و بە کاوەخۆ و هەر دەمنادەمێکیش پەتەکە زیاتر لە ملیان بجەڕێنرێت." و ـ بە دەست پیشانت دا کە چۆن بکرێت، گرگن! ـ مەیگێڕەکەیش سەری نەوازشی بۆ لەقاندیت و پێشانی دا چۆن سەری لە پیاوەتییە پڕ لە پاڵەوانێتییەکەت سووڕماوە. ئەرێ قەت ساوایەکی تازەلەدایکبووی یابانیت لە ئامێز گرتووە،

نیشتمانپەروەری گزگل؟ بە درێژاییی چاخەکان دێیت و سیخوڕە یابانییەکان، سیخوڕە ئەمەریکاییەکان، ژنە کشتیارە ڕووسەکان، ئەنارکیستە ئینگلیزەکان و کۆمۆنیستە یۆنانییەکان هەڵدەواسیت و دەیانکوژیت. ڕەوانەی کورسیی کارەبایی و ژووری گازەکانیان دەکەیت، بەڵام هیچ کام لەم کردانەت، ڕێ لەو قەبزییە ناگرن کە ڕیخۆڵەکانت و بیرکردنەوەکانتی گرتۆتەوە، ڕێ لە نەتوانین و هیچلەباردانەبوویيت لە خۆشەویستیدا، ڕێ لە تووشبوونت بە نەخۆشیی ڕۆماتیزم، یا کولێرا، یا نەخۆشییە دەروونییەکانت، ناگرن. هیچ کوشتن و بڕینێک و هیچ هەڵواسینێک لەو هەژارییە قوتارت ناکەن، کە تێی کەوتوويت.

سەیری خۆت بکە و خۆت ببینە، گرگن! ئەوە تەنیا هیواتە بۆ ڕزگاربوون.

ئەو ڕۆژەت دێتەوە یاد، ژنکۆک! لە عیادەکەمدا دانیشتبوويت و دڵ پڕ لە کینە و بە ڕقێکی زۆرەوە لە بارەی پیاوەکەتەوە، ئەو پیاوەی بەر لە ماوەیەک لێت جیا بووبووەوە، دەدوایت؟ چەندان ساڵ لەگەڵ دایکت، پوورەکانت، برازا و خوشکەزاکانت، لەگەڵ خاڵۆزا و پوورزاکانت، بۆژۆتان کردبوو، بە جۆرێک هێندەی نەمابوو بیخنکێنن، ناچارتان کردبوو چ خۆت و چ خزمەکانت بە خێو بکات. ئەو پیاوەیش، لە دواهەوڵیدا بۆ ئەوەی تەواوی هەست و نەستەکانی بەرانبەر بە ژیان لە دەست نەدات، خۆی لە دەستتان ڕزگار کرد. دواتر، بۆ بەدەستهێنانی یارمەتی هات بۆ لای من. ئەو، بە ویستی خۆی، دوای جیابوونەوەیش، خەرجیی بژێویی تۆ ـ کە سێ بەش لە دەستکەوتەکەی بوو ـ دەیدا، خەرجییەک کە بە یاسایەکی تەواو ناسراو و ئاشنا بە هەموومان، پێورابوو. ئەم حاڵەتە، نرخی ئەو سەربەستییە بوو کە بە دەستی هێنابوو، بەوەیش ناڕەحەت و دڵگران نەبوو، چونکە پیاوێکی گەورە و هونەرمەندێکی گەورە بوو و هونەریش مینا زانستێکی ڕاستەقینە بەرگەی هیچ پێبەند و دەستبەندێک ناگرێت، بەڵام ئەوەی تۆ داوات دەکرد، ئەوە بوو ئەو پیاوەی کە لە دڵەوە ڕقت لێی دەبووەوە،

بتگرێتەوە خۆی، هەرچەند تۆ بۆ خۆیشت کارێک فێر بووبوویت، کارێک کە دەیتوانی لە وابەستەیی بەو پیاوەوە ڕزگارت بکات و بتخاتە سەر پێی خۆت. تۆ دەتزانی کە من یارمەتیی دەدەم، بۆ ئەوەی لە هەموو ئەرکێکی ناهەق ڕزگاری بێت. ئەم یارمەتی و دەستگیرۆییەی من، شێتی کردبوویت. هەڕەشەی چوونە لای پۆلیست لێ کردم، دەتوت: "لەبەر ئەوەی پێویستی بە یارمەتی هەیە، دەمەوێت لەو ڕێیەوە هەموو سامان و دەوڵەتەکەی لە ژێر دەست دەربهێنم. بە مانایەکی دی، بەو کارەت هەموو نیازە پیس و پەلۆخەکانی خۆتت لا ئاشکرا کردم، ژنکۆک! تۆ، پێت گرنگ نەبوو ئەو کارە بەرەوپێش ببەیت، کە فێری بووبوویت، یا بیگەیەنیت بە پلەیەکی باڵاتر، چونکە کارێکی وا لە وابەستەیی ڕزگاری دەکردیت، وابەستەیی بە پیاوێکەوە کە بە درێژاییی چەندان ساڵ ڕقت لێ بووبوو. ئیتر چۆن لەو بڕوایەدایت مرۆڤ بتوانێت بەو شێوەیە دنیایەکی نوێ بونیاد بنێت؟ بیستم، کە هاوڕێیانی سۆسیالیستت هەبوون ـ ئەوانەی هەموو شتێکیان دەربارەی من دەزانی! ـ نابینیت کە تۆ نموونەیەکی دیار و ئاشکرایت، نابینیت کە ملیۆنانن ئەوانەی لە تۆ دەچن و ئەم دنیایەتان تێکوپێک داوە و شێواندووتانە؟ دەزانم کە "لاواز" و "تەنیا"یت، "وابەستەی دایکت"یت، "بێچارە"یت. دەزانم لەبەر ئەوەی خۆت ڕقت لە خۆتە و بەرگەی خۆت ناگریت و سەراسیمە و سەرگەردانیت، بۆیە ژیانت لە مێردەکەت تاڵ کردووە و لێت کردووە بە دۆزەخ، ژنی بچووک! خۆت داوەتە بەر تەوژمی ژیانی ئەمڕۆ و جەڵەبێک لە دادوەران و پاسەوانانی یاسات لە پشتە، بەڵام بڕوام پێ بکە کە ئەوان هیچ بەرسڤێکیان نییە بۆ ئەو هەژاری و کڵۆڵییەی تێی کەوتوویت.

گوێم لێتە و دەتبینم ژنە سکرتێرە گرگنەکە، کە لە یەکێک لە بینای لێپرسینەوە و پیادەکردنی یاساکاندا دانیشتوویت و لە بارەی ڕابوردوو و ئێستا و داهاتوومەوە، لە بارەی بیروڕا سیاسییەکانمەوە، لە بارەی دید و تێڕوانینمەوە لەسەر موڵکایەتیی

تایبەت، لەسەر ڕووسیا و لەسەر دیمۆکراتی دەنووسیتەوە و هاوکاتیش دادوەرکانت لە بارەی پلەوپایەی کۆمەڵایەتیمەوە لێم دەپرسنەوە. لە وەڵامیاندا دەگێڕمەوە کە ئەندامی فەخریی سێ یەکێتیی ئەدەبی و زانستیم؛ لەوانە یەکیتیی پلازمۆگێنی نێونەتەوەیی. ئەوەی لێم دەپرسیتەوە، سەرسووڕماو لێم دەپرسێت: "شتێکی سەیر لێرەدا نووسراوە، نووسراوە کە تۆ ئەندامی فەخریی یەکێتیی پۆلیگامیی نێونەتەوەییت، ئەمە ڕاستە؟" پاشان ـ هەردووکمان پێکەوە بەو هەڵە بچکۆلەیەت پێدەکەنین ـ ئێستا تێدەگەیت، ژنە گرگنە دڕئەندێشەکە، کە من چۆن ئابروو و بێئابروویيم بە دەست دەهێنم؟ بە خاتری ئەندێشەکانی تۆ، نەک ئەو شێوەژیانەی گرتوومەتە بەر. هەرچییەک تۆ دەربارەی ڕۆسۆ بیرت ماوە، هەر هێندەیە کە دەیویست "بۆ سروشت بگەڕێتەوە"، هەر هێندەیە کە گوێی بە منداڵەکانی خۆی نەدا و ڕەوانەی مەیتەمەکانی کردن. تۆ، لە قووڵاییی دەروونتەوە، خەنیت بە بەدبەختی و لێقەومانی کەسانی، چونکە تەنیا ناحەزییەکان بە دی دەکەیت، دزێوییەکانت دێتە بەر گوێ، ئەوی جوانە نە دەبینیت، نە بەر گوێت دەکەوێت.

"گوێ بگرن، هاووڵاتە بەشەرەفەکان، گوێ بگرن! نیوەشەوان چاوم لێی بووە پەردەی ماڵەکەی لادراوە، پێتان وایە لە کاتێکی وادا چی دەکات؟ بە درێژاییی ڕۆژانیش پەردەکانی ماڵەکەی دادراونەتەوە. ئەمە لە خۆڕا نییە، بێگومان، دەبێت شتێکی لە پاڵدا حەشار درابێت!"

بەکارهێنانی ئەم شێوازانە، بۆ دژایەتیکردنی هەقیقەت، چیی تر یارمەتیت نادەن. هەموومان لەوە بەئاگاین کە هیچ گرنگییەکت بۆ پەردەکانی ماڵەکەی من نییە، بۆ تۆ گرنگ بەرگرتن و ڕاوەستانە دژی هەقیقەت. دەتەوێت مینا سیخوڕێک هەر بەردەوام بیت، مینا درۆزنێک بە خراپە لە بارەی کەسانی ترەوە بدوێیت و بەردەوام بیت لەسەر ئەوەی دراوسێیەکەت؛ دراوسێ بێگوناهەکەت، هەر لە بەر ئەوەی هیچ گرنگییەکت پێ نادات و ئاغر و سەربەستە و جۆری ژیانی لەگەڵ جۆری ژیانەکەی تۆدا ناگونجێیت، ڕەوانەی

زیندانەکان بکەیت. تۆ خۆهەڵقورتێنیت، پیاوی بچووک! دەست دەخەیتە کاروباری خەڵکەوە، درۆیان بۆ هەڵدەبەستیت و بە خراپە باسیان دەکەیت. لە بەختی تۆیە کە پۆلیس سیخوڕە نهێنییەکانی خۆی ئاشکرا ناکات.

"گوێ بگرن، ئەی باجدەران بە دەوڵەت، گوێ بگرن! مامۆستای فەلسەفەیە. زانکۆیەکی گەورە لە شارەکەماندا دەخوازێت، بۆ ئەوەی وانە بە لاوەکانمان بڵێتەوە، دایبمەزرێنێت. ئەمە ئابرووچوونە! با بڕووخێت! سەربڵندنی و نەمری بۆ باجدەران! ڕێ بدەن با باجدەران خۆیان بڕیار بدەن چ جۆرە مامۆستایەک لە زانکۆکاندا وانە بە لاوەکانمان بڵێنەوە. ڕێ لە مامۆستا ئازاد و سەربەستەکان بگرن!"



*پاسەوانی ئاکار و ڕەوشتی باوی نێو کۆمەڵ، وزەی "ئۆرگۆن"ی دەپشکنێت.*

ئا بەم جۆرە، کابانە سەرڕاست و ئاغرە باجدەرەکە، ناڕەزاییی خۆت، دژی ئەو مامۆستایەی کە هەقیقەتی لە هەموو شتێک پێ گرنگترە، دەردەبڕیت! لێت پیرۆز بێت، کابانە باجدەرە بەشەرەفە نیشتمانپەروەرەکە، تۆ هەتا ئێستایش لە زانست و فەلسەفەی چوار هەزار ساڵ بەهێزتر و بەدەستەڵاتتریت، بەڵام خەریکە تێدەگەین لێت و درەنگ یا زوو فێڵ و تەڵەکەکانت ڕێیان لێ دەگیرێت و کۆتاییان پێ دەهێنرێت.

"گوێ بگرن، پارێزەرانی ڕەوشتی گشتی، گوێ بگرن! لە پێچی کۆڵانەکەدا دایکێک لەگەڵ کچەکەیدا دەژی. کچەکەی دەتوانێت چ کاتێک بیەوێت، تەنانەت ئێواران درەنگیش، کوڕەدۆستەکەی خۆی ببینێت. ئەو دایکە، بە تاوانی گەوادیکردن، دەبێت بدرێت بە دادگا! لە پۆلیس بگێڕنەوە! دەمانەوێت ڕەوشتی گشتیمان، یاسا و تەکووزی، بپارێزین. پۆلیس ئاگادار بکەن!"

ئەو دایکە سزا دەدرێت، چونکە خۆتێهەڵقورتێنیت و جێگای نووستنی خەڵکانی تر دەپشکنیت. بە تەواوی خۆتت پێشان داوە و ڕازەکانی خۆت ئاشکرا کردووە. دەزانین، چ نیازێکت لە "یاسا و تەکووزی" هەیە. مرۆڤە بەڕەوشتە گرگنەکە! ئەی ئەوە هەر تۆ نیت کە ژێرکراسی ئەو ژنانەی لە باڕەکاندا خزمەتت دەکەن، دەپشکنیت؟ بەڵێ، ئێمە دەخوازین کچان و کوڕانمان ئاشکرا و لەبەرچاوان بە خۆشەویستی و ئەوین شاد بن، نەک وەک تۆ لە کۆڵانە تاریکونووتەکاندا، یا لە پشت ماڵانەوە بە نهێنی و بە دزییەوە بچنە ژوانی خۆشەویستەکانیان. دەخوازین ڕێز لەو باوکودایکە بوێر و سەرڕاستانە بگرین کە لە خۆشەویستیی منداڵەکانیان دەگەن و دەیپارێزن. ئەو دایکوباوکانە ئاولەمەی نەوەی تازەی داهاتوون، نەوەیەکی تەندروست، چ وەک لەش و چ وەک هەست و نەست. نەوەیەک کە هیچ جێپەنجەیەکی ئەندێشە پەڵۆخ و پیسەکەی تۆ "ئەی پیاوە هەرگیز ڕەحەتنەبووەکەی چاخی بیست!" نە بە لەشیانەوە، نە بە هەست و نەستەکانیانەوە، دیارە.

“گوێ بگرن، هاووڵاتان، گوێ بگرن! دواهەواڵتان بیستووە! پیاوێک دەناسم کە بۆ بەدەستهێنانی ئامۆژگاری پەنای بۆ ”ئەم“ بردبوو. ئەمیش، لەبەر ئەوەی دەستدرێژی کردبووە سەری، تەنانەت بەر لەوەی پێ ڕابگات شەرواڵەکەی هەڵبکێشێتەوە، لە دەستی هەڵهاتبوو!“

ئەری لیک بە دەمتدا نایەتە خوارەوە کاتێک ئەم چیرۆکە ”ڕاست و بێگرێوگۆڵە!“ دەگێڕیتەوە؟ دەزانیت ئەم چیرۆکە دەرئەنجامی تێگەیشتنە پیس و پەڵۆخەکانی خۆتە، دەرئەنجامی قەبزبوون و پێداویستیتە بۆ بەدەستهێنانی حەز و ئارەزوو؟ من، قەت وەک تۆ، تاسە و ئارەزووی پیاوانم نەکردووە. قەت وەک تۆ، کچانی گەنج و جوانم لە خشتە نەبردووە و دەستم نەبڕیوون. قەت وەکو تۆ، دەستدرێژیم نەکردووەتە سەر نامووسی ژنێک. هەرگیز، مینا خودی خۆت، بە دەست قەبزییەوە ئازارم نەچێشتووە. قەت ئەوین و خۆشەویستیم نەدزیوە.



*هەوڵدان بۆ هێنانەکایەی ڕۆحە نادیارەکان.*

هیچ ژنێکم لە ئامێز نەگرتووە، ئەگەر خۆی نەیخواستبێت لە ئامێزم بگرێت. قەت، میناى خودی خۆت، بە نیازی خۆنواندن لە بەردەم کەسانی تردا خۆم ڕووت نەکردووەتەوە. خاوەنی ئەندێشەیەکی پیس و پەڵۆخ نیم، وەک تۆ، پیاوی بچووک!

"ئەی ئەمەتان بیستووە؟ هێندە دەستبازی لەگەڵ سکرتێرەکەیدا کرد تا ناچاری کرد بە پەلەپرووسکێ لە ماڵەکەی بێتە دەرەوە! لە ماڵێکدا لەگەڵیدا دەژی، لە ماڵێکدا کە پەردەی پەنجەرەکانی دادرابوونەوە و تا بەری بەیان ڕووناک بوو!"

تۆ وتت: "لامێتری کەسێکی ئارەزوومەند و حەزۆکی بوو و خواردن کوشتی. یا کاتێک لە بارەی باری خێزانیی جێگری میر ڕۆدۆڵفەوە دەدوێیت، کە ژنێکی لە پلەیەکی کۆمەڵایەتیدا نزمتر لە خۆی هێنابوو، ئاو بە دەموپلتدا دێتە خوارەوە و لیک دەکەیت، ئێلیانۆر ڕۆزفلت ژنێکی نائاسایی و ناباو بوو. تۆ وتت: "سەرۆکی یەکێک لە زانکۆکان ژنەکەی بەسەر خەڵکەوە گرتبوو. مامۆستای قوتابخانەی گوندەکەتان دۆستی هەیە. هەر هەموو ئەمانەت، نەوت، پیاوی بچووک؟ تۆ، دانیشتووە کلۆڵەکەی سەر ئەم هەسارەیە، کە هەزاران ساڵە ژیانی خۆتت دۆڕاندووە و ئێستایش تا بینەقاقات لەو زەلکاوەدا کە تێی کەوتوویت نقووم بووە و قوتارت نەبووە.

"بیگرن! سیخوڕی ئەڵمانیایە. دوور نییە سیخوڕی ڕووسیا، یا ئیسلاند بێت! سەعات سێی پاشنیوەڕۆ لە شەقامی ٨٦ لە نیویۆرک بینوومە. لەوەیش زیاتر، لەگەڵ ژنێکدا بوو!"

دەزانیت گرگن مۆرانەیەک لەبەر ئەو تیشکی ڕووناکاییەی لە باکوورە دێت چۆن دەردەکەوێت؟ نەء؟ لەو بڕوایەدام کە نەزانیت. ڕۆژێک دێت یاسای سەخت بەرانبەر بە مۆرانەبوونت بێنە کایەتەوە. یاسای سەخت و توندوتۆڵی دژ بە تۆ و لە پێناو پاراستنی هەقیقەت و ئەویندا. کتومت چۆن ئەمڕۆ تۆ لاوە دڵدارەکان لەو دامەزراوانە توند دەکەیت کە بە نێوی پەروەردەکردن و گۆشکردنەوە دروستت کردوون، تۆیش لەبەر ئەوەی نامەردانە

ناوی خەڵکی مەرد و بەناموس لەکەدار و پیس دەکەیت، لەو جۆرە دامەزراوانە بئاخنرێیت. ڕۆژێک دێت، دادوەر و پارێزەران هەبن، پێچەوانەی ئەوانەی ئەمڕۆ، لەبریی ئەوەی پارێزگاری لە یەکسانییەکی ساختە و لەقاڵبدراو بکەن، پارێزگاری لە یەکسانیی ڕاستەقینە، لە دۆستایەتی بکەن. ڕۆژێک دێت، یاسای سەخت و گرانی وا ببن کە پارێزگاری لە ژیان بکەن و ناچارت بکەن ملکەچیان بیت، پیاوی بچووک! گرنگ نییە چەند ڕقت لێیان دەبێتەوە. دەزانم تۆ لە چاخی داهاتوویشدا، لە چاخەکانی داهاتوویشدا، لەڕێی بە خراپەباسکردن و لە پاشملە بۆهەڵبەستنەوە، لەڕێی پلاندانانی پڕ لە فێڵ و تەڵەکەوە، لەڕێی دیپلۆماسیەت و لەڕێی سزادانی ئەو کەسانەوە کە گوێڕایەڵی یاساکانی کڵێسا و دێرەکان نین، هەر بەردەوام دەبیت لەسەر بە تاعون نەخۆشخستن، بەڵام دواییەکەی لەبەر هەستکردن بە پاکبوونەوە کە ئێستا لە قووڵاییی ناختدا پەنهانت داوە، دەردەکەویت.

هیچ خاوەنشکۆیەک، هیچ تسارێک، هیچ باوکێک لە باوکانی کرێکارانی دنیا، نەیانتوانیوە ڕزگارت بکەن. ئەوان تەنیا دەتوانن بتکەن بە کۆیلە، هیچ کام لەوان نەیانتوانیوە لە بچووکی و هیچلەباردانەبوویی قوتارت بکەن. ئەوەی دەتوانێت ڕزگارت بکات، تەنیا هەست و نەستەکانی خۆتن بۆ بەدەستهێنانی پاکی، بۆ بەدەستخستنی تاسە و ئارەزووت بۆ ژیان.

هیچ دوودڵییەک لەمەدا نییە، پیاوی بچووک! پاکبووەوە لەو نزمی و بچووکییەی کە تێی کەوتوویت، دەست بە بیرکردنەوە دەکەیت. ڕاستە ئەم بیرکردنەوەیە، لە سەرەتادا، لاواز و پڕ لە هەڵە و بێئاکام دەبێت، بەڵام دەمێک دێت، شێلگیرانە، بیر بکەیتەوە. دەمێک دێت، ناچار بیت فێر ببیت چۆن بەرگەی ئەو ئازارە بگریت کە ئەم جۆرە لە بیرکردنەوە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت، کتومت مینا من و کەسانی تر، کە چەندان ساڵی دوورودرێژ، بێدەنگ و بەدانەچیرەوە، ئازاری ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەمان لە بارەی تۆوە چێشتووە. ئەو ئازارەی ئێمە، لە بارەی تۆوە چەشتوومانە، وات لێ دەکات بیر بکەیتەوە.

هەر ئەوەندەیش دەست بە بیرکردنەوە بکەیت ئیتر ناتوانیت بەر لەوە بگریت کە بە سەرسوورمانەوە لەو "شارستانی"یە بڕوانیت کە بونیادت ناوە، ناتوانیت بەر لەوە بگریت، کە بە سەرسوورمانەوە ورد بیتەوە چۆن توانیووتە لەگەڵ ڕۆژنامەکانت، لەگەڵ گۆڤارەکانتدا، هەڵبکەیت؛ کە بێجگە لە نووسین لەسەر نمایشە سوپاییەکان، ڕازاندنەوە، کوشتوبڕ و هەڵواسین، فێڵ و تەڵەکی دیپلۆماسی، کە بێجگە لە ڕێهەڵەکردن، خۆپڕچەککردن و خۆچەککردن و دیسان خۆپڕچەککردن و ڕەشبگیری؛ کە بێجگە لە مەشقی سوپایی و بۆردوومانکردن، شتێکی تریان تێدا نەنووسراوە. ناتوانیت خۆ لەوە دوورەپەرێز بگریت کە چۆن توانیووتە ئەو هەموو قسە پڕوپووچانە هەڵبمژیت، بەبێ ئەوەی لە خەفەت و خەمینیدا، بتەقیت. دەمێک دێت، تێدەگەیت کە تۆ ئەو هەموو کاغەزە چاپکراوانەت، وەک مەڕێکی بەکوێلەکراو، قوتت داوە، کە بە درێژایی چاخەکان وەک مەیموونێک لاسایی ئەو شتانەت کردووەتەوە کە خوێندووتنەتەوە، دووپات و چەندپاتت کردوونەوە. تێدەگەیت، بۆیە بەو نووسینە ساختانە قایل بوویت کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا خوێندووتنەوە، چونکە بیر و هزرەکانی خۆت جێی باوەڕت نەبوون، چونکە لەو باوەڕەدا بوویت کە ئەو نووسینانە نیشتمانپەروەرانە بوون.

دەمێک دێت، لە بەرانبەر ئەو مێژووەدا کە دروستت کردووە، هەست بە تەریقبوونەوە و شەرمەزاری بکەیت. ئەمەیش تاکە هیوای ئێمەیە، کە ئیتر "خوێندنی مێژوو" بۆ نەوەکانی داهاتوومان، نابێت بە ئازارێک بە دەستیەوە بناڵێنن، کە ئیتر لە تواناتدا نابێت بە نیازی گەڕانەوە بۆ دیاری پوتروسی مەزن، هەڵبستیت بە بەرپاکردنی شۆڕشێکی مەزن.

لە ڕوانگەی داهاتووەوە:

ناتوانم بڵێم داهاتووت چۆن دەبێت. نازانم چۆن بەهۆی بەکارهێنانی هێزی "ئۆرگۆن"ی گەردوونیەوە، کە من دۆزیومەتەوە، دەگەیتە

سەر مانگ و مەریخ و ئەستێرەکانی تر. ئەوەیش نازانم کە کەشتییە ئاسمانییەکانت چۆن هەڵدەستن  و بە چ جۆریکیش دەنیشنەوە، یا بە چ شێوەیەک وزەی خۆر بۆ ڕووناککردنەوەی ماڵەکەت بە کار دەهێنیت، یا چۆن بەهۆی دەلاقەیەک لە یەکێک لە دیوارەکانی ژوورەکەتەوە لەگەڵ کەسێکی تر لە ئوستورالیا یا بەغدا دەپەیڤیت، بەڵام دەتوانم پێت بڵێم، ئەوەی لە داهاتوویەکی دوور یا نزیکدا بە هیچ کلۆجێک نایکەیت چییە!

"گوێی لێ بگرن! نەخۆشە نەخۆش! ئەوەم پێ دەڵێت کە نابێت بیکەم! دیکاتۆرە یا!؟"

دیکتاتۆر نیم، گرگن! هەرچەند نزمی و سووکیی تۆ ئەوەی لە بەردەممدا ئاسان کردووە ببم بە دیکتاتۆر. دیکتاتۆرەکانت، ئەوانەن کە لە ئێستادا، بۆ ئەوەی لە ژوورەکانی گاز قوتارت ببێت، پێت دەڵێت چی نابێت بکەیت، بەڵام ناتوانن پێت بڵێن لە داهاتوویەکی دووردا دەبێت چی بکەیت. چەند دەتوانن درەختێک وا لێ بکەن زووتر لە کاتی خۆی گەشە بکات، هەر هێندەیش دەتوانن لەگەڵ تۆدا بکەن.

"ئەم هەموو زانستەت لە کوێوە هێناوە، ئەی ئەو ڕۆشنبیرەی کە توانا و زانستی خۆتت بۆ خزمەتی کرێکارانی شۆڕشگێڕ تەرخان کردووە؟"

لە قووڵایی ناخی تۆوە، تۆ ئەی زرنگە مرۆڤپەروەرە هەمیشە کرێکارەکە.

"گوێ بگرن! زانست و توانای خۆی لە قووڵایی ناخی منەوە هەڵهێنجاوە! من هیچ "قووڵایی"یەکم نییە! بەهەمەحاڵ، چ قسەیەکی تاکەکەسییە، ئەم قسەیە!"

با، گرگن! تۆ "قووڵایی"ت هەیە، بەڵام لێی بێئاگایت. تۆ، تا ڕادەی مردن، لە قووڵاییەکانی ناخت تۆقیویت. هەر لەبەر ئەوەیشە نە

لێیان بەئاگایت، نە دەیانبینیت. هەر لەبەر هێندەیشە، کاتێک لە قوولاییەکانت دەڕوانیت، گێژ دەبیت و ئەژنۆکان دەلەرزێن، وەک ئەوەی لەسەر گاشەبەردێکەوە بەرەوخوار بڕوانیت. تۆ، لەوە دەترسیت "تاکەکەسی"ی خۆت لە دەست بدەیت. سەرباری هەموو نیازێکی پاکیشت بۆ گەیشتن بە خودی خۆت، هەمیشە هەر هەمان پیاوی بەد و پیسکە، هەمان پیاوی غیرەکەر و دزڕەفتار بە دەست دەهێنیت و هەر بە هەمان پیاو دەگەیت.

ئەگەر خاوەنی ناخێکی قووڵ نەبوویتایە، ئەم وتە دووروودرێژەم بۆ نەدەنووسیت، پیاوی بچووک!

قوولاییەکانی ناخت دەناسم، چونکە وەک پزیشکێک، کاتێک پەشۆکاو و دڵ پڕ لە سکاڵا بە دەست پشێوییەوە، دەهاتیت بۆ لام، قوولاییەکانی نێو ناختم دۆزییەوە. قوولاییەکانی ناخت، داهاتووە مەزنەکەتە. هەربۆیە بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەتوانم پێت بڵێم لە داهاتوودا چی ناکەیت. تۆ بە خۆت لە تواناتدا نییە لەوە تێ بگەیت بۆ بە درێژاییی چەندان چاخی ڕابوردووی ناکولتووری ئەوەت کردووە و ئەنجامداوە کە کردووتن. ئێستا دەتەوێت گوێ بگریت؟

"بۆ نا! چ قەیدی هەیە گوێ بۆ گێڕانەوەی چیرۆکێکی تری پڕ لە ئەندێشە و خەیاڵ ڕادێرم؟ بەڵام دۆکتۆرە ئازیزەکەم، سەربارەی ئەوەیش، تازە کار لە کار تـرازاوە و هیچ شتێک ناکرێت. من هەر هەمان پیاوی بچووکم، هەمان پیاوە باوەکەی نێو کۆڵان و شەقامەکان و هەروەهایش دەمێنمەوە. پیاوێک کە هیچ بۆچوون و بیروڕایەکی تایبەت بە خۆی نییە. من کێم! تا خاوەنی دیتن و بۆچوونی تایبەت بە..."

گوێ بگرە، پیاوی بچووک! تۆ لە پاڵ ئەفسانەی "پیاوە گرگن"ەکەدا خۆت مەڵاس داوە، چونکە دەترسیت بکەویتە نێو تەوژمی ژیانەوە و ناچار بێت بە مەلەکردن، مەلەکردن بۆ هیچ نا، تەنیا بۆ خاتری داهاتووی منداڵەکانت و منداڵەکانیان.

بەر لە هەر شتێک، کە لە داهاتوودا نایکەیت، هەستکردنتە بەوەی کە تۆ پیاوێکی گرگن و هیچلەباردانەبوویت، پیاوێک کە خاوەنی دید و بۆچوونی تایبەت خۆی نییە. ئەو پیاوەی کە دەڵێت: "من کێم تا!..." لە داهاتوودا تێدەگەیت، کە بێئاگاییت لەوەی خاوەنی بیروڕا و بۆچوونی خۆتی، کە پارێزگارینەکردن و دەرنەبڕینی بیروڕا و بۆچوونە تایبەتەکانت، گەورەترین سووکایەتییەکە بۆت.

"ئەی "ڕای گشتیی خەڵک" بەرانبەر بە بیروڕا و بۆچوونەکانم چی دەبێت؟ ئەگەر نیاز و مەبەستەکانی خۆم بدرکێنم، مینا کرمێک، لە ژێر پێیاندا دەپلیشێنرێمەوە!"

ئـەوەی تۆ بە "ڕای گشتیی خەڵک" نـاوی دەبـەیت، بریتییە لە سەرجەمی ئەو بیروڕا و بۆچوونانەی کە هەموو پیاو و ژنە گرگنەکان هەیانە. هەر پیاوێکی بچووک، هەر ژنێکی بچووک، خاوەنی دید و بۆچوونی تایبەت بە خۆیەتی، دید و بۆچوونی هەندێک جاران ڕاست و هەندێک جارانیش ناڕاست. بیروڕا و بۆچوونە ناڕاستەکانیان، دەرئەنجامی سڵەمینەوە و ترسیانە لە بیروڕا و بۆچوونی پیاوان و ژنانی تری گرگن. هەربۆیەیش بیروڕا و بۆچوونە ڕاستەکان ڕۆشنایی نابینن و دەرناکەون. بۆ نموونە: تۆ چیی تر لەو باوەڕەدا نابیت "کە جێی هیچ ناگریت و هیچ نرخێکت نییە". دەمێک دێت، هەست بکەیت کە تۆ هەڵگر و پارێزەری ئەو کۆمەڵەی مرۆڤایەتیت کە لە داهاتوودا ڕووبەڕووی دەبیتەوە. ڕامەکە! ڕاوەستە و ترست لێ نەنیشێت، بەرپرسیهەڵگرتن و پاراستنی ئەو کۆمەڵە ئینسانییە هێندە تۆقێنەر نییە.

"دەبێت چی بکەم بۆ ئەوەی ببم بە هەڵگر و پارێزەری ئەو کۆمەڵە ئینسانییە؟"

پێویست ناکات شتێکی تایبەت یا نائاسایی بکەیت. لەسەر ئەوە بـەردەوام بە کە دەیکەیت. کێڵگەکانت بکێڵە، چەکوشەکەی نێو دەستت بە کارامەیی بە کار بهێنە، نەخۆشەکانت بپشکنە، یاری

لەگەڵ منداڵەکانت بکە، بیانبە بۆ قوتابخانە، لە بارەی ڕووداوەکانی ڕۆژەوە بنووسە، قووڵتر لە نهێنییەکانی سروشت ورد ببەرەوە. هەموو ئەو شتانە لە ئێستادا دەکەیت، بەڵام پێت وایە گشتیان بێبایەخن. پێت وایە، ئەوەی گرنگ و بەبایەخە ئەوەیە کە مارشاڵ پینەوپەڕۆ یا میرفوودراو دەیکات یا دەیڵێت.

"تۆ خەون دەبینیت، دۆکتۆر! ئەدی نابینیت مارشاڵ پینەوپەڕۆ و میرفوودراو سەربازانیان پڕچەک و ئامادە کردووە بۆ بەرپاکردنی جەنگ، نابینیت داوام دەکەن بۆ بەشداربوون لە جەنگدا، بۆ ئەوەی کێڵگەکانم، نووسینگە و تاقیگەکانم بۆمباران و تەفروتوونا بکەم!"

بۆ بەشداربوون لە جەنگدا داوا دەکرێیت و کێڵگەکانت، کارگەکانت و تاقیگەکانت بۆمباران دەکرێن، چونکە هەر خولیای هاتوهاوار و پێداهەڵدانی گەورەکانتی. ئەگەر بەرگریت لە توانا و زانستی خۆت بکردایە، بتزانیبایە و لێت ڕووت بووایە کە مرۆڤ لە کێڵگەکاندا دەبێت گەنم و لە کارگەکاندا کەرەستەی نێوماڵ و پێڵاو، نەک چەک، بەرهەم بهێنێت. کە کێڵگە و کارگەکان بۆ ئەوە دروست نەکراون، خاپوور بکرێن، ئەوا میرفوودراو نە سەربازانی دەبوو، نە چەک.

مارشاڵ پینەوپەڕۆ و میرفوودراو، لەمانە بێئاگان، چونکە هیچ کاتێک لە کێڵگەیەک، نووسینگەیەک یا کارگەیەکدا کاریان نەکردووە. ئەوان پێیان وایە، تۆ بۆ بەرزکردنەوەی ئابرووی ئەڵمانیا، یا ئابرووی کرێکاران، کار دەکەیت، نەک بۆ ئەوەی جلوبەرگ و بژێوی بۆ منداڵەکانت بە دەست بهێنیت.

"کەواتە دەبێت چی بکەم؟ جەنگم ناوێت! کاتێک بۆ بەشداربوون لە جەنگدا داوا دەکرێم و لەشکرە کرێکارییەکان وڵاتەکەم داگیر دەکەن، ژنەکەم بەوپەڕی خەمینییەوە دەگری، منداڵەکانم لە برساندا دەناڵێنن و ژمارەی لاشەکان تا بێت زیاتر دەبن. هەرچییەک داوای دەکەم ئەوەیە کە لێم بگەڕێن لە کێڵگەکەمدا بە کاری خۆمەوە

خەریک بم، ئێواران دوای دەستهەڵگرتن لە کار، لەگەڵ منداڵەکانمدا یاری بکەم، ژنەکەم لە ئامێز بگرم. ڕۆژانی پشوویش، بە لێدانی مۆسیقا و سەماکردن و گۆرانیوتن بە سەر ببەم. چی بکەم؟"

لەسەر ئەوە بەردەوام بە کە هەمیشە کردووتە و هەمیشە خواستووتە بیکەیت. کار بکە، ڕێ بدە بە منداڵەکانت بەختەوەرانە پێ بگەن، ژنەکەتت خۆش بووێت. ئەگەر بەئاگا لە گەیشتن بە ئامانجەکانت، جێپێی ئەم کردەوانە هەڵبگریت، قەت هیچ جەنگێکی تر بەرپا نابێت، چیی تر ژنەکەت نابێت بە نێچیری بەر دەستی ئەو سەربازە داوێنپیسانەی بە دەست ناوگەڵیانەوە دەناڵێنن، منداڵە بێباوکە برسییەکانت شەقامەکان ناتەنن، خۆیشت ناچار نابیت لە پاڵ تەومژێکەوە کە بەری چاوانی گرتوویت، بڕوانیتە "زێدی پیرۆز".



*من چیم تا خاوەنی دید و بۆچوونی تایبەت بە خۆم بم!؟*

"بەڵام ئەی چی بکەم، ئەگەر بمەوێت بۆ کار و ژن و منداڵەکانم بژیم و پاشان هۆنەکان، یا ئەڵمانیاییەکان، یا یابانییەکان، یا ڕووسەکان بێن و وڵاتەکەم داگیر بکەن، پێت وا نییە، ئەوسا، ناچارم بە شەڕکردن و بەرگریکردن لەماڵەکەم؟"

ڕاست دەکەیت، پیاوی بچووک! هەر کاتێک هۆنەکانی ئەم یا ئەو نەتەوە پەلامارت بدەن، دەبێت دەست بدەیتە چەک، بەڵام ئەوەی ناتوانیت بیبینیت ئەوەیە کە هەر هەموو "هۆنەکان"ی ئەم یا ئەو نەتەوە شتێکی تر نین لە ملیۆنان پیاوی تری خۆتئاسایی نێو وڵاتانی تر زیاتر، کە بەردەوام و بێبڕانەوە خەریکی هاتوهاوار و پێداهەڵدانی گەورەکانیانن! کاتێک میرفوودراو ـ ئەوەی کار ناکات! ـ بۆ بەشداریکردن لە جەنگدا بانگیان دەکات، کتومت وەک خودی خۆت، پێیان وایە کە هیچ پێوانەیەکیان بۆ دانانرێت و کەڵکی هیچ ناگرن و دەڵێن: "من کێم تا خاوەنی دید و بیروڕای خۆم بم؟"

هەر دەمێک بەئاگابوویت لەوەی کە تۆ کەسێکی، کە تۆ دید و بۆچوونی تایبەت بە خۆت و ڕاست و ڕەوانت هەن، کە کێڵگەکانت، کارگەکانت لە خزمەتی ژیاندان نەک مردن، ئەوسا دەتوانیت بەرسڤی ئەو پرسە بدەیتەوە کە نەختێک لەمەوبەر لە خۆتت کرد. ئەوسا لە هاتوهاوار و پێداهەڵدان و چەپڵەلێدان بۆ گەورەکانت دەکەویت، دەست لەوە هەڵدەگیریت بە چەپک گوڵ لەسەر گۆڕی "سەربازی ون" دابنێیت. "سەربازە نەناسراوەکەت زۆر چاک دەناسم، گرگن! سەربازە نەناسراوەکەتم لە ئیتالیا ناسی کاتێک لە چیاکانیدا دەجەنگام. ئەو، هەر هەمان پیاوە گرگنەکەیە، مینا خودی خۆت، ئەو پیاوەی پێی وایە کە خاوەنی دید و بۆچوونی تایبەت بە خۆی نییە!" لەبریی ئەوەی هۆشیاریی نەتەوەییت لەبەر پێیەکانی میرفوودراودا دابنێیت، یا ڕێ بدەیت مارشاڵی کرێکاران پێت پێدا بنێت، بە متمانەکردن بە خۆت و بە هۆشیاریت بەرانبەر بە نرخی خۆت و شانازیکردنت بە کارەکەتەوە، بەرەنگاریان بەرەوە، بۆ ئەمەیش پێویستت بە هیچ دەمڕاستێک نییە لە سەرت بێتە دەنگ.

دەتوانیت پێوەندی لەگەڵ برا گرگنەکەتدا بگریت لە هەر کۆییەک بێت، لە یابان، لە چین یا لە هەر خاکێکی تردا، ڕێی پێ بدەیت لە بیروڕا و دیتنە ڕاستەقینەکانت، دەربارەی کارەکەت، دەربارەی بوونت مینا پزیشکێک، کشتیارێک، باوکێک یا مێردێک ئاگادار بێت. لە ئاکامدا بڕوا بەوە بهێنیت، کە ئەوەی لە ئەستۆیەتی،

بەتەنگەوەهاتنی ئەوین و کارەکەیەتی، بۆ ڕاگرتن و بەرپانەبوون و مەحاڵبوونی ڕوودانی هەر جەنگێک.

“ئەمانە هیچیان خراپ نین، بەڵام ئێستا بۆمبای ئەتۆمییان هەیە، تەنیا بۆمبایەکیش لەو بۆمبایانە دەتوانیت ببێت بە مایەی کوشتنی سەد هەزاران کەس!“

مێشکت بە کار بهێنە، پیاوی بچووک! لەو باوەڕەدایت میرفوودراوە کە ئەو بۆمبا ئەتۆمییانە دروست دەکات؟ نەء! ئەو بۆمبایانە ئەو پیاوە بچووکانە دروستیان کردوون کە لەبریی ئەوەی دەست لە دروستکردنی ئەو بۆمبایانە بکێشنەوە هەر خەریکی هاتوهاوار و با بڕی و چەپڵەلێدانی خۆیانن!

دەبینیت، بوویت بە کرۆکی باسەکە و هەموو شتەکان پێوەندن بە تۆوە، لە تۆوە و بۆ تۆ دەگەڕێنەوە، گرگن! بۆ بیرکردنەوەکانی تۆ دەگەڕێنەوە، گرنگ نییە ڕاستن یا چەوت. ئەگەر تۆ، زانا هەرە مەزنەکەی چەرخی بیستەم، هێندە بچووک نەبوویتایە بە ئاستەم بە چاو ببینرێت، ئەوا لەبریی پەرەپێدانی هۆشیاریی نەتەوەیی، هۆشیاریی دنیاییت پەرە پێ دەدا و دەتتوانی بە زیرەکیی خۆت ئەو کەرەستە پێویستانەت بدۆزییایەتەوە کە بەریان لە دروستکردنی بۆمبای ئەتۆمی بگرتایە و ڕێی نەدایە ڕۆشنایی ئەم دنیایە ببینن، یا ئەگەر گووتەنی پەرەپێدان و بەرەوپێشچوونی زانستی ڕێی ئەنجامدانی ئەم کارەیشی پێ نەدایتایە، هەموو دەستەڵاتێکت بە کار دەهێنا بۆ ڕێزگرن لە بەکارهێنانی.

سەرسووڕماو، لە پێچاوپێچێکدا کە دەستکردنی خۆتە، ڕێ دەکەیت و هیچ ڕێیەک بۆ دەربازبوونت نادۆزیتەوە، چونکە بیرکردنەوە و تێڕوانینت ئاراستەیەکی نادروستیان وەرگرتووە. تۆ، ملیۆنان پیاوی بچووکت دڵنیا کرد کە دەکرێت وزە ئەتۆمییەکەت بۆ چارەسەرکردنی شێرپەنجەکەیان، ڕۆماتیزمەکەیان، بە کار بهێنرێت، لە کاتێکدا زۆر چاک دەتزانی کە قەت ناکرێت ئەو وزەیە بۆ چارەسەرکردن بە

کار بهێنرێت و چەکێکی قڕکەت خولڤاندووە و هیچی تر. بەم کارە، کەوتیتە هەمان کۆلانی دەرنەچووەوە، کە "فیزیک"ەکەت تێیدا گیری خواردووە. ئەمە دەزانیت، بەلام ناتەوێت دانی پێدا بنێیت. دوادوایتە گرگن! من وزەی گەردوونیم پێ بەخشیت، ئەو وزەیەی من دۆزیومەتەوە. ئەمە دەزانیت پیاوی بچووک! چونکە ڕوون و ئاشکرا و بە دەنگێکی بەرز لە بارەیەوە بۆت دواوم، بەلام خۆتت لێ بێدەنگ کردووە و بەردەوامیت لەسەر مردن بە شێرپەنجە و دلوەستان، لەسەر جێگەی مردنەکەیشتەوە هەر هاوار دەکەیت: "نەمری و سەربلندی بۆ کولتوور و تەکنیک!" با پێت بلێم، گرگن! چاوکراوە و بەئاگا گۆڕەکەی خۆتت هەلکەندووە. تۆ پێت وایە "چاخی وزەی ئەتۆمی" دەستی پێ کردووە. ڕاست دەکەیت، چاخێکی نوێ دەستی پێ کردووە، بەلام بەو شێوەیە نا کە تۆ تێی دەگەیت. لەناو دۆزەخەکەی تۆوە دەستی پێ نەکردووە، بەلکو لە تاقیگە خۆگر و بێدەنگەکەی منەوە، لە قوژنەیەکی دوورەدەستەوە لە ئەمەریکا دەستی پێ کردووە.

خۆت سەرپشکیت لەوەدا بتەوێت بەشداریی جەنگ بکەیت یا نا. ئەگەر هێندە بتزانیبایە کە بۆ ژیان کار دەکەیت، نەک بۆ مردن! ئەگەر هێندە لەوە بەئاگابوویتایە کە هەموو پیاوە گرگنەکانی سەر ئەم زەمینە، بە دیوە ڕووناک و تاریکەکانیانەوە، کتومت وەک خۆتن.

ئێستا یا دەمێکی تر ـ تەواو لە ژێر ڕکێفی خۆتدایە ـ دەست لەوە هەلدەگریت هاتواهاوار بکەیت و بە گەورەکانتدا هەلبلێیت، دەست لەوە هەلدەگریت لە کێلگەکانتدا بۆ ئەوە کار بکەیت کە دواتر بەرهەمەکەی تەفروتوونا بکەیت، یا ڕێ بدەیت کارگەکانت ببن بە نیشانە بۆ ئاگرباران. ئێستا یا دەمێکی تر ـ درەنگ و زوویی کەوتووە ـ تێدەگەیت کە بۆ ژیان کار دەکەیت، نەک بۆ مردن.

"ئەی داوای مانگرتنی گشتی بکەم؟"

نازانم ئاخۆ داوایەکی وا، یا هەر شتێکی تر کە دەخوازیت بیکەیت، پێویستە یا نا. مانگرتنە گشتییەکەت، کەرەستەیەکی بەهێز نییە بە دەستتەوە، لە کاتێکی وادا بەوە گوناهبار دەکرێیت ـ لەڕاستیشدا وایە ـ کە ڕێ بۆ برسیبوونی ژن و منداڵەکانت خۆش دەکەیت. بە مانگرتنی گشتی، هیچ بەڵگەیەک بە دەستەوە نادەیت کە بەختیاری یا بەدبەختیی کۆمەڵەکەتت دەوێت. کاتێک مان دەگریت، کار ناکەیت! پێم وتویت، ڕۆژێک دێت بۆ ژیانت کار دەکەیت. ئەگەر دەیشخوازیت دەستبەرداری "مانگرتن" نەبیت، ناوی لێ بنێ "مانگرتن لە کار"، مان بگرە، بەو نیازەی بۆ خۆت و بۆ منداڵەکانت و بۆ ژنەکەت و بۆ دەستگیرانەکەت و بۆ کۆمەڵەکەت و بۆ ئەو شمەکانەی بەرهەمت هێناون و بۆ کێڵگەکەت، کار بکەیت. پێیان ڕابگەیەنە کە چیی تر کاتت نییە بە جەنگەکانی ئەوانەوە بە فیڕۆی بدەیت و شتی گرنگتر لە جەنگەکانی ئەوانت هەن بیانکەیت. تەیمانێک بە دەوری هەرێمێکی بەرفراواندا، لە دەرەوەی هەر یەکێک لە شارە گەورەکانتدا لەسەر ڕووی ئەم زەوییە بگێڕە و لێگەڕێ با سوپاسالار و دەمڕاستە گەورەکانت یەکتری تێیاندا ببڕێننەوە. ئەمە ڕاستترین شتێکە بیکەیت، ئەگەر دەست لە هاتوهاوار و پێداهەڵدانی گەورەکانت هەڵبگریت و واز لەو بڕوایە بهێنیت کە تۆ هیچ نیت و کەڵکی هیچ ناگریت، ئەگەر واز لەوە بهێنیت کە تۆ خاوەنی دید و بۆچوونی تایبەت بە خۆت نیت.

هەموو شتەکان لەنێو دەستی خۆتدان. ژیانت، ژیانی منداڵەکانت، چەکوشەکەت، ئەو ئامێرەی بۆ پشکنینی نەخۆشەکانت بە کاری دەهێنیت. دەزانم سەر ڕادەوەشێنیت، چونکە لەو بڕوایەدایت خەون دەبینم، یا لەوانەیە پێت وا بێت "سوور"م. دەپرسیت ئاخۆ چ کاتێک ژیانت چێ دەبێت و لە ژیانت دڵنیا دەبیت. بەرسڤی ئەم پرسەت بە شێوەی بوون و ژیانت نامۆیە.

ژیانت، کاتێک چاکتر دەبێت،، کاتێک دڵنیا دەبیت لێی، کە "ژیان" بۆ تۆ لە "دڵنیایی" گرنگتر بێت، "ئەوین" بۆ تۆ لە "پارە" گرنگتر بێت، "سەربەستبوون"ت لەو "ڕێ"یەی پارتییەکەت بۆی هەڵبژاردوویت،

لەو شتەی ناوت لێناوە "ڕای گشتی" گرنگتر بێت، کاتێک ئاوازەکانی بتهۆڤن یا باخ دەبن بە ئاوازەکانی بوون و ژیانت، "ئەو ئاوازانەی لە ناختدان، بەڵام لە سووچێک لە سووچەکانی دەروونتدا لە گۆڕت ناون"، کاتێک بیرکردنەوەکانت لەگەڵ هەست و نەستەکانتدا تەبا دەبن، نەک دژ و ناتەبا؛ کاتێک لە وەختی خۆیدا لە لێهاتوویی و کارامەیی خۆت دەگەیت، کاتێک لە وەختی خۆیدا لە پیربوونت تێدەگەیت، کاتێک لەگەڵ بیر و هزری پیاوانی زانا و گەورەدا دەژیت، نەک لەگەڵ کارە خراپەکانی جەنگاوەرە گەورەکاندا. کاتێک مانگانەی مامۆستای منداڵەکانت زیاتر دەبێت لە مانگانەی پیاوە سیاسییەکانت. کاتێک زیاتر ڕێز لە ئەوینی ڕاستەقینەی نێوان ژن و پیاو دەگریت وەک لە پسوولەی مارەبڕین. کاتێک پێش وەخت لە هەڵەکانی بیرکردنەوەکانت دەگەیت، نەک وەک ئەمڕۆ درەنگ و لە ناوەختدا. کاتێک کە هەقیقەت دەبیسیت خەنی دەبیت و بیستنی کلێشە باوەکان بێزارت دەکەن. کاتێک بۆ خۆت پێوەندی لەگەڵ هاوڕێ کرێکارەکانتدا دەکەیت لە وڵاتانی تر، نەک لەڕێی دەمڕاستەکانتەوە. کاتێک بەختیاریی کچەکەت لە خۆشەویستیدا، لەبریی ئەوەی توورەت بکات دەتخەنێنێ. کاتێک سەر لەو یادە با دەدەیت کە کەسێک ڕێی لێگرتووە یا سزای داوە لەبەر ئەوەی منداڵەکەت دەستی بۆ ناوگەڵی بردووە. کاتێک سەروسیمای ئەو مرۆڤانەی لە شەقامەکاندا دەیانبینیت، سەربەستی و زیندوویی و شادی دەبەخشن، نەک خەمینی و کلۆڵی. کاتێک خەڵکی بەسەر ڕووی ئەم زەمینەدا بە سکی ڕەوان و ناوگەڵی نەبەستووەوە، دێن و دەچن.

تۆ داوای ڕێنوێنی و ئامۆژگاری دەکەیت، گرگن! بەڵام بە درێژاییی چاخەکان ڕێنوێنی و ئامۆژگاریت، چ بە باش و چ بە خراپ، کراوە. لەبەر نەبوونی ئامۆژگاری و ڕێنوێنی نەبووە کە تا ئێستایش هەر لە کلۆڵیدا دەژیت، بەڵکو لەبەر سووکی و نزمیی خۆت بووە. دەتوانم چەندان ئامۆژگاری چاکت بدەمێ، بەڵام بەو شێوەیەی هەنووکە بیر دەکەیتەوە، قەت ناتوانیت لە بوارەکانی ژیانتدا بە کاریان بهێنیت و سوودیان لێ ببینیت.

گریمان ئامۆژگاری ئەوەم کردیت کە دەست لە هەموو دیپلۆماسییەتێک هەڵبگریت و بیگۆڕیتەوە بە توان و کارامەییت لە کارەکەتدا، بە دۆستایەتیت لەگەڵ گشت پینەدۆزەکان، ئاسنگەرەکان، دارتاشەکان، میکانیکییەکان، تەکنیککارەکان، پزیشکەکان، مامۆستاکان، نووسەرەکان، ڕۆژنامەنووسەکان، کارگێڕەکان، کرێکارانی کانەکان یا کشتیارانی گشت وڵاتانی دنیا، بۆ ئەوەی لێگەڕێین پینەدۆزانی دنیا خۆیان بڕیار بدەن بە چ شێوەیەکی باش دەتوانن پێڵاو بۆ هەموو منداڵانی چین دروست بکەن، بۆ ئەوەی لێگەڕێین کرێکارانی کانەکان بە خۆیان ئەو ڕێگاچارەیە بدۆزنەوە کە چۆن خەڵک لە سەرماوسۆڵە بپارێزین، مامۆستایانی هەموو نەتەوە و وڵاتەکان بە خۆیان ڕێیەک بدۆزنەوە تا منداڵان لەو ڕەحەتنەبوون و نەخۆشییە دەروونییانە بپارێزن کە لە داهاتوودا تووشیان دەبن، ئەگەر ڕووبەڕووی ئەم هەقیقەتە بەڵگەنەویست و تەندروستە، لە بارەی ژیانی ئینسانییەوە، بوویتەوە، چی دەکەیت؟

بۆ چاوتروکاندنێک وا دابنێ کە وەک کۆمۆنیستێک تێم ناڕوانیت! بە خۆت، یا لەڕێی نوێنەرێک لە نوێنەرانی پارتییەکەتەوە، کڵێساکەتەوە، میرییەکەت یا نەقابەی کرێکارانەکەتەوە ڕووبەڕووم دەوەستیتەوە و دەڵێیت:

“من کێم تا بتوانم پێوەندییە دیپلۆماسییەکان بەو پێوەندییانە بگۆڕمەوە کە لەسەر بناغەی کار و پرسە کۆمەڵایەتییەکان بونیاد نراون؟“

یا:

“ناتوانین خۆمان لەو جیاوازییە نەتەوەییانە خافڵ بکەین کە لە بەرەوپێشچوون و پەرەپێدانی زانست و کولتوورەکاندا هەن!“

یا:

“ئایا دەکرێت لەگەڵ ئەڵمانیاییە فاشییەکان، یابانییەکان و ڕووسە

کۆمۆنیستەکان، یا ئەمەریکاییە سەرمایەدارەکاندا پێوەندی بگرین!“

یا:

“من بەر لە هەموو شتێک وڵاتەکەمم؛ ڕووسیا، ئەڵمانیا، ئەمەریکا، ئینگلتەرا، ئیسرائیل، عەرەبستانم بە لاوە گرنگە.“

یا:

“هێندەم کار هەیە بەس بێت بۆ ئەوەی بتوانم ژیانی خۆم ڕێکوپێک بکەم و بە کاروباری نەقابەی بەرگدرووانی وڵاتەکەمدا ڕابگەم، با یەکێکی تر ئەرکی ڕێکوپێککردنی کاروباری بەرگدرووەکانی وڵاتانی تر بگرێتە ئەستۆ.“

یا:

“گوێ بۆ ئەو سەرمایەدارە ئەو بۆلشۆفیکە، ئەو ترۆتسکییە، ئەو فاشییە، ئەو ئینتەرناسیونالییە، ئەو سێکسوالییە، ئەو جوولەکەیە، ئەو بێگانەیە، ئەو ڕۆشنبیرە، ئەو خەونبینە، ئەو تۆباوییە، ئەو دیماگۆگییە، ئەو پێداهەڵدەرە، ئەو شێتە، ئەو تاکەکەسە، ئەو ئەنارکییە مەگرە! هیچ هۆشیارییەکی ئەمەریکایی، ڕووسی، ئەڵمانیایی، ئینگلیزی، یەهوودیت نییە؟“

بێ دوودڵی یەکێکت لەو دەربڕینانە بە کار دەهێنا بۆ ئەوەی خۆت لەو بەرپرسییە بدزیتەوە کە ڕاگرتنی پێوەندییە ئینسانییەکانی خستۆتە ئەستۆت.

“کەواتە هیچ نرخێکم نییە و کەڵکی هیچ ناگرم؟ تۆ دان بە هیچ خەسڵەتێکی بەرزدا کە لە مندا هەبێت، نانێیت؟ دەمفلیقێنیتەوە. دەبینیت مرۆڤێکم و شێلگیرانە لە پێناو ژن و منداڵەکانمدا کار دەکەم، ژیانێکی باش دەژیم و خزمەتی گەل و وڵاتەکەم دەکەم. ناکرێت تا ئەو ڕادەیەیش خرپ بم!“



کەواتە هیچ نرخێکم نییە و کەڵکی هیچ ناگرم؟

دەزانـم، کە تۆ مرۆڤێکی چووست و هالیکار و توندوتۆڵیت، بوونەوەرێکی چاپووک و چالاک، کتومت مینا هەنگێک یا مێروولەیەک لە کارکردندایت، تەنیا شتێکی کە من کردبێتم ئەوەیە کە پیاوە گرگنەکەی ناختم ئاشکرا کـردووە، ئەو پیاوە گرگنەی ڕەنجی هـەزاران ساڵی بە فیڕۆ داویت. تۆ "گەورە"یت، پیاوی بچووک! کاتێک کە بچووک و هیچوپووچ نیت. گەورەییت تەنیا هیوایەکە کە تا ئێستا ماوەتەوە. "گەورە"یت، کاتێک بە خۆشەویستییەوە کارەکەت ئەنجام دەدەیت. کاتێک بە هەڵکۆڵینی هونەریی دارێک، بە بیناکردن، بە شەتڵچاندن و بە ڕەنگکردن و ڕازاندنەوە شاد و خەنی دەبیت. "گەورە"یت، کاتێک چێژ لە تێڕوانینی دیمەنی ئاسمانی شین، لە بینینی ئاسکان و ئاونگی بەربەیان، لە مۆسیقا و سەما، لە بینینی لەشی جوان و ناسکی منداڵەکانت و ژنەکەت یا پیاوەکەت وەردەگریت. "گەورە"یت، کاتێک بە نیازی فێربوون لە ئەستێرەکانی ئاسمان دەڕوانیت، یا ڕوو دەکەیتە کتێبخانەیەک بۆ ئەوەی بخوێنیتەوە و فێر ببیت کە پیاوان و ژنانی تر چۆن بیر لە ژیان دەکەنەوە. "گەورە"یت، کاتێک مینا باپیرەیەک وەچەکانت دەخەیتە باوەشتەوە و لە بـارەی کاتە بەسەرچووەکانەوە، لە بارەی ڕابـوردووەوە، بۆیان دەگێڕیتەوە. "گەورە"یت، کاتێک لە چاوانی وەچەکەتەوە، چاوانێک کە پڕن لە خۆتێهەڵقوورتاندنێک کە جێی متمانەیە، دەڕوانیتە داهاتوویەکی نادیار. "گەورە"یت، کاتێک مینا دایکێک، کۆرپەکەت ڕادەژەنیت و دەیلاوێنیتەوە، کاتێک چاو پڕ لە فرمێسک داوای بەختەوەری بۆ دەکەیت لە داهاتوودا، کاتێک بە درێژایی سـاڵان، سات لە دوای سـات، پڕ بە دڵت خۆزگەی داهاتوویەکی پڕ لە بەختەوەری بۆ دەخوازیت.

تۆ "گەورە"یت، پیاوی بچووک! کاتێک گۆرانییە میللییە چاک و کۆنەکان دەچڕیت، یا کاتێک بە دەنگی ئۆکۆردیۆنێک دێیتە سەما، چونکە گۆرانییە میللییەکان سووکنایین بۆ گیان و لە سەرانسەری دونیادا چوونیەکن. "گەورە"یت، کاتێک بە هاوڕێیەکەت دەڵێیت:

“سوپاسی چارەنووسی خۆم دەکەم، چونکە دوور لە داوا و ناجۆری ژیاوم، چونکە گەورەبوون و پێگەیشتنی منداڵەکانم، گروگاڵیان، ڕۆیشتن و خۆکێشانەوەیان، یاریکردن و پرسەکانیان، پێکەنین و ئەوینیانم بە چاوی خۆم بینی، چونکە هەست و نەستەکانی خۆم بەرانبەر بەهار و شنەباکان، بەرانبەر خوڕەی ئەو چەمەی بە لای ماڵەکەمدا تێپەڕ دەبێت و بەرانبەر جریوەی باڵندەکانی نێو دارستان پاراست، چونکە بەشداری قسەهەڵبەستن و قسەهێنان و بردنی دراوسێ سەگسارەکانمم نەکرد، چونکە بەختەوەر بووم بە لەئامێزگرتنی ژنەکەم، یا پیاوەکەم و هەستم بە تەوژمی ژیان کرد لە لەشمدا، لە کاتە ناخۆشەکاندا، لەو کاتانەدا کە سەرم لێشێوابوو، ڕەوتی خۆم بەر نەدا، چونکە ژیانم پڕ مانا و بەردەوامییە، چونکە هەمیشە گوێم بۆ دەنگی ناخی خۆم شل کردووە، کە پێی وتووم: “تەنیا شتێک هەیە بەبایەخ و گرنگە ئەویش ژیانە بە شادی و خۆشبەختی. شوێن دەنگی دڵت بکەوە، کاتێک لەو ترس و خەمینییەی گیانی داگیرکردوویت دوورت دەخاتەوە، سەرسەخت و دڵبەکینە مەبە، ئەگەرچی ژیان هەندێک جاریش گرانە.” کە کاری ڕۆژانەم تەواو بوو، لە بێدەنگیی ئێوارەدا، لە باخچەی بەردەمی ماڵەکەمدا لەگەڵ خۆشەویستەکەمدا، یا لەگەڵ منداڵەکانمدا، دادەنیشم و گوێ لە هەناسەکانی سروشت دەگرم، ئەوسا گۆرانییەک لە ناخمەوە بەرز دەبێتەوە، گۆرانییەک کە پڕ بە دڵ حەز بە بیستنی دەکەم، گۆرانییەک کە لە بارەی داهاتووی مرۆڤایەتییەوەیە: “ئێوە، ئەی ملیۆنان لە خەڵک لە ئامێزتان دەگرم و پڕ بە فراوانیی ئەم دنیایە ماچتان دەکەم!” پڕ بە دڵ و لە ناخەوە دەخوازم ئەم ژیانە فێر ببێت مافەکانی خۆی بپارێزێت، ئەو گیانە پڕ ترسانە بگۆڕێت کە ڕێ دەدەن بۆمباکان بتەقنەوە. ئەو گیانانەی کە تەنیا لەبەر ئەوەی ژیان لە دەستیان هەڵهاتووە، ئەو کارە دەکەن. کوڕە بچکۆلەکەم لە ئامێز دەگرم، کاتێک لێم دەپرسێت: “بابە، خۆر ئاوا بوو، چ ڕێیەکی گرتۆتە بەر؟ ئاخۆ بەم زووانە هەڵدێتەوە یا؟” منیش پێی دەڵێم: “ئا، کوڕی خۆم، بەم زووانە دەگەڕێتەوە و گەرممان دەکاتەوە.”



*تاسە و ئارەزوو.*

گەیشتمە کۆتاییی وتەکەم بۆ تۆ، گرگن! بێگومان دەمتوانی بەردەوام بم، بەڵام ئەگەر بە وریایی و سەرڕاستییەوە ئەم وتەیەت خوێندبێتەوە، ئەوا تەنانەت لەو جێیانەیشدا کە من پێشانم نەداویت پیاوە بنەمۆمەکەی ناخی خۆت دەدۆزیتەوە، چونکە هەمیشە هەر هەمان شتە کە بیرە بچووکەکان و هەڵسوکەوتەکانت لێ تێک دەدات.

هەرچییەک بەرانبەر بە من کردووتە، هەرچییەک لە داهاتوودا بەرانبەر بە من دەیکەیت، گرنگ نییە بە بلیمەت ناوم دەبەیت یا فڕێم دەدەیتە یەکێک لە دینگەکانەوە، گرنگ نییە، مینا ڕزگارکەرێک، شانازیم پێوە بکەیت یا وەک سیخوڕێک ئازار و ئەشکەنجەم بدەیت و هەڵمبواسیت، درەنگ یا زوو، پێداویستییەکان ناچارت دەکەن لەوە تێ بگەیت کە من یاساکانی ژیانی زیندووم دۆزیوەتەوە و کەرەستەیەکی وام پێ بەخشیویت کە بتوانیت بە هۆشیارییەوە ژیانی خۆت بە ڕێوە ببەیت. بە جۆرێک کە هەتا هەنووکەیش تەنیا توانیوتە ئامێرەکان بە ڕێوە بەریت. من ئەندازیارێکی دڵسۆزی ڕێکخراوەکەت بووم، نەوەکانی داهاتوو جێپێییەکانی من هەڵدەگرن و دەبن بە ئەندازیاری دڵسۆز و کارامەی سروشتی ئینسانی. من دەرگام لەسەر ئەو ژیانە بێسنوور و بەرفراوانەی دەروونت، لەسەر سروشتی گەردوونیت، ئاوەڵا کردووە. ئەمەیش بۆ من گەورەترین پاداشتێکە پێم درابێت.

بۆ خونخوارەکان، زاڵمەکان، هیچوپووچ و قەشمەرەکان. بۆ سیسارک و کەمتیارەکان پەیڤی ئەم حیکمەتە دەڵێمەوە: "من تۆوی بەبڕشتی پەیڤە پیرۆزەکانم لەم دنیایەدا چاندووە لە کاتێکدا دەمێکە درەختەکان وشک هەڵاتوون و بەندەن و کێوەکان هەرەسیان هێناوە، لە کاتێکدا دەمێکە پاشا خاوەنشکۆکان، مینا تۆوی گەڵا وشکەکان، کەوتوونەتە دەم با، لەگەڵ هەر تۆفانێکدا هەزاران کەشتی دێن و پەیڤەکانی من هەڵدەگرن:

"داهاتوو هی منە!"

# فەرهەنگۆک

سەدەم: هۆ، سەبەب.

پچەک: کەمێک، نەختێک.

پەردەک: مەتەڵ.

تەڤلەهەڤ: تێکەڵپێکەڵ، تێکهەڵشێلدراو.

ژنکۆک: ژنی بێ ناوونیشان، بەرانبەری بۆرەپیاو.

مینا: وەک، وەکو.

تەوقەنە: تەوقەن، بەرزترین جێ.

باهۆز: گەردەلوول، گێژەڵووکە.

کەلاش: جەندەکی حەیوانی مردراوەبوو.

دینگە: شێتخانە.

تابگە: جێگەی لەنگەرگرتنی گەمی و بەلەم و کەڵەک.

خاما: کچی عازەب.

کۆڵەمستانێ: ملاکمە.

هەژەند: بەڵای لەڕادەبەدەر.

گلۆڤەر: هەسارە، کوکب.

بزاڤ: جووڵە، جووڵانەوە.

دۆزەوە: لە دۆزینەوەوە، بۆ هەر دەرئەنجامێک کە لە نەبوونەوە هاتبێتە بوون.

زیندە: بەشەپێکهێنەری هەرەبچووک لە بوونەوەردا.

ڕاژەکردن: مانالێکدانەوە.

تەکووزی: ڕێکوپێکی، دوزەنە.

پلوپا: هەوڵ و تەقەلا.

جڤین: کۆبوونەوە.

چاوەقوولکە: چاوەقوولە، تاعون.

دۆز: مەبەست لە ژیاندا.

گووتەن: مەنتیق، لۆژیک.

پلازمۆگێنی: جەنەتیکی پلازما.

پۆلیگامی: فرەژنە.

ئەم کتێبە لە زمانی سویدییەوە، وێڕای پێداچوونەوە و

بەراوردکردن لەگەڵ وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەیدا، وەرگێڕدراوە.


بڕوانە:

Lyssna, Lille Man

Tal till den lille mannen

av Wilhelm Reich

Illustrerad av William Steig

Översättning av Barry Karlsson

هەروەها بڕوانە:

Wilhelm Reich

Listen, Little Man

Translated by Ralph Manheim

with lllustrations by William Steig



پەیوەندی

khabat.aref@comhem.se



*Bokförlaget Aura*

٢٠١٠

به درێژاییی چاخەکانی بەردەمت هەمان هەڵە دووپات دەکەیتەوە تا ئەودەمەی خۆت و گشت وێکچووەکانت لە ئاکامی ئەو کلۆڵییە کۆمەڵایەتییە سەرانسەرییەی تێی کەوتوویت لە نێو دەچن و دەمرن؛ مردنێکی بێشومار و بەکۆمەڵ، تا ئەو دەمەی ترسی بە یەکجاری لەبەینچوون و فەوتانت، پچێک ئاگادارت دەکاتەوە و هۆشت دەهێنێتەوە بەر خۆت، دواتر، بەرە بەرە و گاڤ بە گاڤ، خۆت فێر دەکەیت، بە دوای هاوڕێکانتدا بگەڕێیت؛ ئەو هاوڕێیانەی بەرهەمی ئەوین و کارکردن و توانستی زانستین، خۆت فێر دەکەیت چۆن دۆستایەتییان بە دەست بهێنیت، لێیان تێ بگەیت، ڕێزیان لێ بگریت و نرخی خۆیان پێ بدەیت؛ خۆت فێر دەکەیت و لەوە تێ دەگەیت کە کتێبخانەیەک بۆ ژیانت گرنگترە لە چوونە دیدەنی یارییەکی کۆڵەمستانێ؛ خۆت فێر دەکەیت کە پیاسەی نێو دارستانێک چاکترە لە پێداهەڵدان و پەسندانی ڕەوت و نمایشە سوپاییەکان، خۆت فێر دەکەیت متمانەبەخۆکردن چاکترە لە متمانەکردن بە نەتەوە؛ خۆت فێر دەکەیت کە چارەسەرکردن لە کوشتن چاکترە، کەمداواکردن چاکترە لە پێداهەڵدانی نیشتمانپەروەری و هەر غەڵبەغەڵب و ساغڵەمەیەکی دیکەی لەو چەشنە.

*Bokförlaget Aura*

*2010*